# (80) ساڵ تەعریب کردنی کوردستان !

جەلال جەوهەر عەزیز

## بەشی یەکەم :

لەمێژووی زانراوو تۆمارکراوی میللەتی کورد دا، وادەردەکەوێ کە کوردستانو میللەتی کورد ماوەی زۆرتر، وڵاتەکەی داگیرکراوەو، میللەتەکەشی بن دەست بووە.

مێژووی داگیرکردنو بن دەستی زۆر زیاتر بووە لەمێژووی ئازادیو سەرفرازی ... ماوەی داگیرکردنەکەش هەمیشە ئەوەندە زۆرو زیاد بوە، بۆیە نەیتوانیوە ئەوەی کە هەیبووە لە کەلتوری سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی، وەك پێویست بیپارێزێ، لەبەرئەوە، ئەمرۆ لە کوردستان زیاتر شوێنەوارو کەلتوری جۆراوجۆری داگیرکەرانی کوردستان باوەو کاری پێ دەکرێ، لەهی رەسەنی میللەتی کورد، چونکە هەر داگیرکەرێك کە هاتووە، سروشتو مۆرکی خۆی دارشتوە بەسەر سروشتو مۆرکی میللەتی کورد دا.

شوێنەواری داگیرکردنو ژێر دەستی بەهەموو بوارەکانی ژیانییەوە دیارە، لەزمانو فەرهەنگ، باری ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئیداریو دەرونی بەسەر شارو شارۆچکەو گوندو شاخو دۆڵ، تا رادەیەك بەسەر هۆشو بیرکردنەوەشدا.

هەر پارچەیەکی کوردستان، کاریگەریی سروشتی داگیرکەری میللەتی سەردەستی پێوە دیارە، تا رادەی ئەوەی بە ئاسانی میللەتی کورد لەپارچەکانی کوردستان لەیەك جیا دەکرێنەوە، بەشێوەی زمان، نەریتی کۆمەڵایەتی، نەریتی ژیانی ئیداریو سیاسیو باری رۆشنبیریو ...هتد .

لەهەزار ساڵی رابردوودا، کوردستان دوچاری هێرشو پەلاماری جۆراوجۆری داگیرکەران بۆتەوەو زیانی گیانیو سامانیو سیاسیو کەلتوری یەکجار کوشندەی بەرکەوتووە. هێرشو پەلاماری مەغۆلەکان، شەڕو ململانێی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو سەفەوی لەساڵی (1508)و بۆ ماوەی چوار سەد ساڵ ....

ئەنجامی ئەم شەڕو ململانێیە، کوردستان داگیرکراو، کرا بە دوو پارچەو میللەتی کوردیش دابەش بوو بەسەر ئەم دوو پارچەیەدا، زیانی زۆری گیانیو سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی بەرکەوت.

دیارە چوار سەد ساڵ لەشەڕو ململانێی داگیرکردن، کارەساتو ماڵ وێرانی زۆری بەدواوە دەبێ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

ئیدارەی ناوچەکە لەژێر دەستی میللەتەکە نەماو، کەوتە ژێر دەسەڵاتو فەرمانی داگیرکەران، کورد بریاری بەدەست خۆی نەماو، ئیدارەی سیاسیو قەدەریشی بوون بە دوو، ئابوریەکەشی کەوتە ژێر دەسەڵاتی هەردوو ئیمپراتۆریەت، باری کۆمەڵایەتیش ئاڵوگۆڕی یەکجار زۆری بەسەردا هات، بەهۆی دابەشبوونی کورد بەسەر هەردوو لادا، لەو شەڕو ململانێیە تا گەیشتە ئەوەی ناکۆکیو دوژمنایەتیو دووبەرەکی دروست بێ لە نێو کوردی هەردوو لاو، نێوان ریزەکانی کورد لەهەر پارچەیەك.

کەلتوری میللەتەکەشمان هەڕەشەی سڕینەوەی لێ دەکرا، هەموو شتێکی بەسەردا داسەپا، لەزمانو نەریتی کۆمەڵایەتی، بنەمای ئیداری داگیرکەر، سەرەنجام ناوی هەزاران گوندو شارو شاخو دۆڵیان گۆڕی بۆ ناوی تورکی، وەك قەرەتەپە، قەرەداغ، قەرەبەگ، قەرەناز، قزلەر، گوك تەپە، ئاچداغو ....... کە تائێستاش هەزاران ناوی بەتورکی کراو هەیە لەکوردستانی تورکیاو کوردستانی عیراقو هەر جێگایەك کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی داگیری کردبێ، بەهەمان شێوە لەپارچەکانی تری کوردستان، داگیرکەران هەموو هەوڵێکیان داوە بۆ سڕینەوەو لەناوبردنی کەلتوری نەتەوایەتی میللەتی کورد.

جەنگی جیهانیی یەکەم (1914 – 1919) لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایەكو بەریتانیاو فەرەنساو هاوپەیمانان لەلایەکی تر لەناوچەکە، کارەساتو نەهامەتیو نائومێدی زۆرتری بەسەر میللەتی کورددا هێنا.... کوردستان لەم شەڕو ململانێیەدا، بوو بەگۆڕەپانی شەڕو پێکدادان، بەهۆی شەڕەوە زیانی گیانیو سیاسیو ئابوری زۆری لێکەوت.

کوردستان بەهۆی ئەم شەڕەوە لە دوو پارچەوە کرا بە چوار پارچەو، دابەش کرا بەسەر چوار وڵاتو، سێ زمانو، سێ کەلتوری جیاوازدا، باری ژیانی میللەتی کورد گۆڕا بەرەو خراپتر، ئەوەی پاراستبوی لەچنگی داگیرکەرانی عوسمانیو سەفەوی لەبواری سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیدا لەئاکامی ئەم داگیرکردنو دابەش کردنەدا لەدەستی دا، تەنانەت زمانی زگماکی خۆیشی لەبەشێکی کوردستان لێ قەدەغەکرا.

ئەنجامی شەڕی جیهانی یەکەم لە کوردستان، بەشی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان، بەپێی ڕێکەوتنی سایکس بیکۆ لە (9 – 16 ⁄ 5 ⁄ 1916 )، کرا بە سێ پارچەوە، بەشێکی لەژێر دەسەڵاتی تورکو، دووپارچەی خرایە سەر هەردوو دەوڵەتی تازە دروست کراوی عیراقو سوریا بەشی رۆژهەڵاتیش لەژێر دەسەڵاتی ئێرانیەکان مایەوە، بەم جۆرە لایەکی تری کوردستان داگیرکراو لەچوارچێوەی هەردوو دەوڵەتی عیراقو سوریا لەقاڵب درا.

کەواتە پرۆژەی تەعریب لە کوردستانی عیراق لەو رۆژەوە دەست پێ دەکات کە باشوری کوردستان بە پیلانێکی نێودەوڵەتیو بەهاوکاریو پشتگیریو پێ داگرتنی زۆری ئینگلیز لەچوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا لە قاڵب درا.

## پرۆسەی تەعریب لەکوردستانی باشوور:

سنوری ئێستەی دەوڵەتی عیراق، پێش شەڕی جیهانیی یەکەم لەساڵی 1914، پێکهاتبوو لەسێ ویلایەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەناوی ویلایەتی بەغداو موسڵو بەسرە.....

هەموو نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو سێ ویلایەتەو ویلایەتەکانی تری ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لە ئاسیاو ئەفەریقیا, لەنەتەوەکانی عەرەب، کورد، بەربەرو هەموو نەتەوەکانی تر هاودەردبوون لەگەڵ یەکتردا، هەموو هاوبەش بوون لەو زوڵمو ستەمەی ئەنجام ئەدرا دەرهەق بەگەلانی ناوچەکە لەلایەن دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە. لەبەرئەوە نەتەوە زوڵم لێکراوەکانی ناوچەکە شتی هاوبەشیان زۆربوو لەهەستی هاوبەش، وەزعی سیاسیو ئابوری هاوبەش، باری دەروونی هاوبەش لەبەرامبەر داگیرکەر....
جگە لەهەندێ ململانێی ئیداریو کۆمەڵایەتی کە داگیرکەری عوسمانی دروستی کردبوو لە نێوان نەتەوەکانو لەنێوان عەشیرەتەکانی میللەتەکان، لەپێناوی ئەوەی کەمیللەتەکانو عەشیرەتەکان بەگژی یەکتردا بکاتو هەمیشە لەشەڕو ململانێی نێوانیاندا سوودمەند بێ، لەسەر بنەمای سیاسەتی (فرق تسد) (دەوڵەتی عوسمانی لەدروست کردنی جیاوازیو شەڕو کێشەو ئاژاوەی نێوان نەتەوەکاندا بەرژەوەندی خۆی بپارێزێ).

لەبەرئەوە نەتەوەکانی ژێردەستە، لەسنووری دەسەڵاتی عوسمانییەکان، کۆك بوون لەسەر ئەوەی یەك داگیرکەری هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئیمپراتۆریەتی عوسمانییە.

لەپێناوی رزگاری وڵاتو رەت کردنەوەی زوڵمو ستەمی چوارسەد ساڵەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو ئازادی میللەتان، بەشێکی زۆری نەتەوەکان کۆکو رێك بوون لەسەر هاوکاری دەوڵەتانی هاوپەیمان.... بەئومێدی ئەوەی ئینگلیزو فەرەنساو روسیا ببنە رزگارکەری میللەتانی ناوچەکە.

ئاشکرایە هاتنی وڵاتانی هاوپەیمانیش، لەبەر خاتری گەلانی ناوچەکە نەبوو، بەڵکو هاتن بۆ تێکشاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو دەرپەڕاندنی لەناوچە گرنگەکانی ئاسیاو ئەفریقیاو داگیرکردنی ئەو ناوچانەو سەرلەنوێ دابەشکردنی بەسەر دەوڵەتانی هاوپەیماناندا، بۆ وەدەست هێنانی ئامانجە ئابوریو سیاسیەکانیان لەناوچەکە.

ئەنجامی هاتنی ئیستعماری ئینگلیزو فەرەنسی بەخێرو خۆشیو رزگاری بۆ هەندێ نەتەوە کۆتایی هات، وەك نەتەوەی عەرەب لەئاسیاو ئەفریقیا لەدواجار، چونکە دوای دەرپەڕاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو هاتنی هاوپەیمانان، ژمارەیەکی زۆر لەوڵاتە عەرەبیەکان کە ئێستا هەن، ئازاد بوونو سەربەخۆییان وەدەست هێنا، جگە لەکوردستانو میللەتی کورد لەئاسیاو بەربەر لەئەفریقیا نەبێ بەداگیرکراویو دابەشکراوی مانەوە. بەربەرەکانیش لەباکوری ئەفریقیا چارەنوسیان لەکورد چاکتر نەبوو، ئەوانیش وڵاتو میللەتیان بەسەر وڵاتانی مەغریبو تونسو جەزائیرو .... دابەشکرا.

بەوجۆرە کێشەی کورد لە کێشەیەکەو دووان بوو بە چوار کێشەی زۆر ئالۆز، دوژمنەکانی لەیەکو دووەوە بوون بە چوار...، میللەتی کورد کێشەکەی قورسترو ئالۆزتر بوو، ئومێدی رزگاریو ئازادی بەجارێك کز بوو....

## مێژووی ئینگلیز لەناوچەکە:

سەرەتای پەیوەندی بەریتانیا لەگەڵ ئەو ناوچەیەی کە ئێستا پێی دەوترێ عیراق، دەگەڕێتەوە بۆ 15ی/کانونی دووەمی /1766، کە بۆ یەکەمجار حکومەتی بەریتانیا نوێنەرێکی خۆی لەبەغداد دانا، حکومەتی بەریتانیا بۆ دۆزینەوەی بازاڕی پێویست، تا کالای خۆی تیا ساغ بکاتەوە، لەساڵی (1834) رەزامەندی حکومەتی عوسمانی وەرگرت بۆ بەکارهێنانی ئاوی دیجلەو فورات بۆ هاتوچۆو هێنانو بردنی کەلوپەلەکانی.

پەیوەندی بەریتانیا لەگەل حکومەتی عوسمانی، گەیشتە ئەوەی بەریتانیا کونسلی هەبێ لەشارەکانی بەغدا، بەسرە، موسڵ، کەربەلا، نەجەف.

حکومەتی بەریتانیا بۆ جێگیربوونی خۆی، پەیوەندیو هاوکاری بازرگانی خۆی خۆش کرد لەگەڵ ئێرانو شێخەکانی کەنداو، تا بەریتانیا بوو بە هێزێکی سەرەکی لەناوچەی کەنداو، جولانەوەی بازرگانیشی بەسەر هەموو ناوچەکەدا زاڵ بوو. زۆربەی کەرەستەی نێردراو بۆ ناوچەکەو کەرەستەی دەرچوو لەناوچەکانی بەسرەو، بەغداو، موسڵ، لەژێر کۆنترۆڵی کۆمپانیاکانی بەریتانیادا بوون.

پەیوەندی نێوان بەریتانیاو عوسمانیەکان تا دەهات زیادی دەکرد، تا لە ساڵی (1909)، عوسمانیەکان رێگەیاندا بەدەزگا زانستیەکانی بەریتانیا بێنە ناوچەکە بۆ گەڕان بەدوای کانە جۆراوجۆرەکاندا[1].

دکتۆر (روهەر باکر) لەکتێبی (رێگای بەغداد)دا ئەلێ:-

(سەردانی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکوكو باباگورگوڕم کرد، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە ئەو دوو ناوچەیە ئەوەندە گرنگە، زیاد لەناوچەکانی قەفقاس لەروسیا ...، هاوکات بەریتانیاو فەرەنسا زۆر بەگەرمی سەرقاڵی گەیاندنی ئاینی مەسیحی بوون بەهەموو مەزهەبەکانەوە، بۆ ویلایەتەکانی بەسرە، بەغداو موسڵ. لەو پێناوەشدا دەیان سەنتەری ئاینیو قوتابخانەیان دروست کرد لە شارو شارۆچکەکانی ناوچەکە.

دوای تێگەیشتنو شارەزابوونی ولاتانی ئەوروپای پیشەسازی، لەگرنگی ناوچەکە، هەم وەك بازاڕێك بۆ ساغ کردنەوەی کەلوپەلی پیشەسازی خۆیانو هەم لەبەر دەوڵەمەندی ناوچەکە بەپترۆڵو کانزاکانی تر، بە بەروبوومی کشتوکالیو ئاژەلی، وەك خورما، گەنم، پێست... ئەوە بووە هۆی ئەوەی ململانێو بەربەرەکانی زۆر دروست ببێ لەنێوان حکومەتەکانی بەریتانیاو ئەڵمانیاو لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسا، هەریەکەیان بەگەرمی خەریکی زیادکردنی نفوزی خۆیان بوون لە ناوچەکە، لەپێناوی ئامانجە سیاسیو ئابووریو ئاینیەکانی خۆیان. لەگەڵ داگیرکردنی هەر سێ ویلایەتی بەغداو بەسرەو موسڵو دابەش کردنی ناوچەکە بەسەر ولاتانی هاوپەیمان، ئینگلیز کەوتە ململانێو بەربەرەکانێو فێڵ کردن لەفەرەنسیەکان لەکاتی دابەشکردنی ناوچەکە.!

بەپێی رێکەوتنی سایکس بیکۆ (1916) – بەشی فەرەنسا بریتی بوو لەبەشی زۆری سوریاو بەشێکی خوارووی ئەنادۆڵو ویلایەتی موسڵ. بەشی ئینگلیز بریتی بوو لەخوارووی سوریاو هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە ... بەلام ئینگلیزەکان لەبەر دوو هۆی گرنگ بیریان لەوە دەکردەوە کە ویلایەتی موسڵ بکەنە سەر بەشی خۆیان، یەکەم: لەبەر گرنگی ئەو ناوچەیە لەرووی ئابوریو دەوڵەمەندی پترۆل.... دووەم: بۆئەوەی فەرەنسا بکەوێتە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی روسیاو بەریتانیا.... لەبەر بونی ئالۆزی لەنێوان بەریتانیاو روسیا[2] . لەبەرئەوە لەکانونی یەکەمی ساڵی 1918دا فەرەنسا رازی بوو لەسەر ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر بەشی بەریتانیا بەلام بە (3) مەرج : یەکەم/ فەرەنسا بەشێکی نەوتی (ویلایەتی موسڵ)ی پێ بدرێ، دووەم/ بەریتانیا پشتگیری تەواوی فەرەنسا بکات لەدژی هەموو نارەزاییەکی ئەمەریکی، سێیەم/ دیمەشقو حەلەبو ئەسکەندەرونە بخرێنە ژێر دەسەلاتو بەشی فەرەنسا[3] . ئا بەم جۆرە ویلایەتی موسڵ کەوتە سەر بەشی بەریتانیا...

سەرەرای ئەوەی فەرەنساو بەریتانیاش رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی ناوچەکە لە نێوان خۆیاندا، کەچی تورکیا هەر دەستبەرداری ویلایەتی موسڵ نەبوو، ئەویش هەر لەبەر گرنگی ئابوری ئەو ناوچەیەو هەم تورکیا لەوە دەترسا کە کورد لەناوچەکە قەوارەیەك بۆ خۆی دروست بکاتو ببێ بە دەوڵەت، کە ئەمە بەحیسابی تورکیا کار دەکاتە سەر دوا رۆژی یەکێتی تورکیا.

بۆ ئەم کیشەیە لە نێوان تورکیاو بەریتانیا، لیژنەیەك لە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی دروست بوو بۆ ساغ کردنەوەی ویلایەتی موسڵ لەو نێوانە ...

بەڵام هێشتا لیژنەکە دروست نەکرابوو و دەستی بەکاری خۆی نەکردبوو، بەریتانیا لەهەموو قۆڵێکەوە خەریك بوو بۆ مسۆگەر کردنی ویلایەتی موسڵو دواتر بە عەرەب کردنی ویلایەتی موسڵ بەم جۆرە:

یەکەم: بەریتانیا بە خشکەییو پەیتا پەیتا خەریکی هێنانی هێزی سەربازی زیاتر بوو، بۆ سەغڵەت کردنو دەرپەڕاندنی هێزو دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکە، ئەنجام عوسمانیەکان ناوچەکەیان بەجێ هێشت، بەریتانیا دەسەڵاتی خۆی داسەپاند بەسەر زۆربەی ناوچەکەو ویلایەتی موسڵدا.

دووەم: بەگەرمی خەریکی کۆکردنەوەی پشتگیری جەماوەریی بوە لە ناوچەکە لە نێو هەموو نەتەوەو توێژەکانی کۆمەڵ بۆ پشتگیری خۆیانو بۆ دژایەتی کردنی عوسمانیەکان... لەم رووەوە گرنگی تایبەتی ئەدا بە مەسیحیەکانی ناوچەکەو ئەو مەسیحیانەی کە ئاوارەبوونو بەهۆی شەڕی عوسمانیەکانەوە لەتورکیا تا ئەندازەی ئەوەی خۆی بە خاوەنیان ئەزانی، هەر بۆیە جێگای زۆر گرنگو ناسکی تەسلیم کردن لە دەزگا سەربازیو ئیدارەیی ... ناوچەکە.

سێیەم: لەرووی سیاسیشەوە، لەئاستی دەرەوەو ناوەوە بەریتانیا خەریکی ئامادەکردنی پێویستیەکانی دروست کردنی رژێمێکی پاشایەتی بوو لەعیراقداو، لەژێر چاودێری خۆی، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بەرنامەیە، حکومەتی بەریتانیا نوێنەرێکی سیاسی خۆی نارد بۆ بەغدا بە ناوی (پرسی کۆکس)و لە 11ی تشرینی یەکەم 1920 ئەو نوێنەرە گەیشتە بەغدا – کەپێشتر حاکمی سیاسی عام بوو لەعیراق- خەڵکی بەغدا بە خۆشیەوە پێشوازیان لێکرد. دوای پێشوازیەکە نوێنەری سیاسی حکومەتی بەریتانیا ئەم قسانەی خوارەوەی بۆ کردن:

(دەوڵەتی بەریتانیا منی بۆ هاوکاریو رێککەوتن لەگەڵ پیاوماقوڵو سەرۆکەکانی عیراق ، بۆئەوەی بگەین بە ئامانجی داواکراو, بۆ هەردوولا و پێکهێنانی حکومەتی عەرەبی، حکومەتی سەربەخۆ بەتێڕوانینی دەوڵەتی بەریتانیا، بۆ ئەم ئامانجە هاتووم ، بەڵام هێشتا بێ بڕواییو نائارامیی هەیە، هەڵبەتە بەم شێوەیە کار ناکرێت، من ئامادەم هەر کاتێ هەل هاتە پێش، ئەویش لەدەستی ئێوەدایە)[4].

هەروەها وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا، ونستن تشرتل لەئەنجومەنی گشتی بەریتانیا لە 1921/6/14 بەم شێوەیە لەسەر عیراق قسەی کرد:

(رەنگە ئەوەتان لەیاد بێ کە لەمانگی حوزەیرانی 1920 وتارێك بڵاوکرایەوە لەعیراقدا تێیدا هاتبوو: (پرسی کۆکس)، پایز دەگەڕێتەوەو ئەوەی خراوەتە ئەستۆی کە حکومەتێکی عەرەبی بەدڵو رەزامەندی خۆی دروست بکات وەبەشێکی زۆری تەواو بووە. حکومەتێکی کاتی دروست کرد، بەسەرۆکایەتی نەقیب، ئێمە دەزانین سەماحەتیان دڵسۆزی زۆریان نواندووە لەبواری خزمەتگوزاریو هاوکاریو نیازیش وایە ئەم حکومەتە کاتیەیە بگۆڕدرێ بە ئیدارەیەکی تر لەرێگای ئەنجومەنێکی گشتی هەڵبژێردراو لەچەند مانگی ئایندەدا، وحاکمێکی عەرەبی بێتە سەر کار، وڵات پێی رازی بێو دروست کردنی سوپایەکی عەرەبی بۆ بەرگری لە نیشتمانو..... تادەڵێ: حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا لەدژی ئەمیر فەیسەڵ نییە بۆ خۆپاڵاوتن، ئەگەر هەڵبژێردرا حکومەتی بەریتانیا پشتگیری دەکاو ئێستا بە رێگاوەیە بەرەو بەسرە...)[5].

لەم دوو وتارەی کوکسو ونستن تشرشل، نیازو نیەتی حکومەتی بەریتانیا زۆر ئاشکرا دەردەکەوێ، کە دەیانەوێ: دەوڵەتێکی عەرەبی دروست بکەن سنورەکەی هەر سێ ویلایەتی موسڵو بەغداو بەسرە بێ، حاکمێکی عەرەبی وەك ئەمیر فەیسەڵ بکەن بە شای عیراقو حکومەتێکی عەرەبیو سوپایەکی عەرەبی دروست بکەن.

دەوڵەتێکی عەرەبی، حاکمێکی عەرەبی، حکومەتێکی عەرەبی، سوپایەکی عەرەبی!! چی ئەگەیەنێ؟ بەڵێ: ئەمە تێڕوانینی بەریتانیا بووە بۆ دوا ڕۆژی هەر سێ ویلایەتی بەغداو موسڵو بەسرە! نیازو نیەتی گڵاوی حکومەتی بەریتانیا زیاتر ئاشکرابوو کە بەکردەوە کەوتە بەعەرەب کردنی هەر چواریان: دەوڵەت، حاکم، حکومەتو سوپا. بەم شێوەیە:

بەریتانیا حکومەتێکی کاتی بەسەرۆکایەتی (عبدالرحمن النقیب) پێکهێنا لە 25/تشرینی یەکەمی/ 1920. لەم حکومەتەدا وەزارەتی بەرگریو وەزارەتی تەندروستی درا بە دوو کەسی ناوچەی کەرکوک کە ئەوانیش جەعفەری عەسکەریو عەزەت پاشای کەرکوکی بوون، داود الیوسفانی کە خەڵکی موسڵ بوو، کرا بە وەزیری بێ وەزارەت. لەشوباتی ساڵی 1920 کەرکوکی کرد بە لیوا، وەفتاح پاشای کرد بە موتەسەریفی لیوای کەرکوک، کەرکوک بوو بە یەکێك لە لیواکانی عیراق .

حکومەتی بەریتانیا ئەم هەنگاوانەی نا، لەکاتێکدا هێشتا کێشەی ویلایەتی موسڵ کە بریتی بوو، لەسنوورەکانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانیو موسڵ یەکلا نەبووبۆوە لەلایەن کۆمەڵەی گەلان. کەرکوكو موسڵ بەرەسمی نەخرابوونە سەر دەوڵەتی عیراق .... مەبەستی بەریتانیا ئەوەبوو، هەرچی زووە کەرکوكو موسڵو سلێمانی ببەستێتەوە بە حکومەتی تازە دروست کراوی عیراقەوە.

سەبارەت بەسلێمانیش، پرسی کوکس، بڕیاریدا خۆی سەرپەرشتی بکات لەچوارچێوەی دەوڵەتی عیراقی تازەو لە 12/9/1922 بەریتانیەکان تەکلیفی شیخ مەحمودیان کردو دایان نا وەك موتەسەریفی سلێمانی، بەڵام ئیتر ئەوەبوو شیخ مەحمود لە مانگی تشرینی دووەمی / 1922، حکومەتی مەلەکی خۆی لەسلێمانی ڕاگەیاند.

هاوکات حکومەتی بەریتانیا پاپۆڕی جەنگیی (نورس بڕۆك)ی لەجەدەوە ئامادەکرد بۆ گوێزانەوەی ئەمیر فەیسەڵی کوڕی شاحوسێن – سعودیە، لە 23/حوزەیرانی/1921 پاپۆڕەکە لە میناى بەسرە لەنگەری گرتو، ئەمیر فەیسەڵو مستر کورنوالیس، کە دواتر بوو بە ڕاوێژکاری ئەمیر فەیسەڵو وەزارەتی ناوخۆی عیراقو، ڕۆستەم حەیدەر سکرتێری ئەمیرو، ژمارەیەك لەسەرۆك عەشیرەتی ڕاکردوی عەرەب لە سنوری بەغدا – بەسرەی لە گەڵدا بوو، لە بەسرە دابەزینو، لە 29/حوزەیران/1921 گەیشتە بەغدا.

دوای دانوستاندنی زۆر لە نێوان حکومەتی نەقیب لەلایەكو پرسی کوکسو چەرچڵ لەلایەکی تر، بڕیاردرا، لەڕێگای وەزارەتی ناوخۆوە، لیژنەیەك دروست بکرێ بۆ هەر لیوایەكو، ڕەوانەی لیواکان بکرێن بۆ تۆمارکردنی ڕای جەماوەری سنورەکە، لەسەر ڕەزامەند بوون، یان ڕەزامەند نەبوون، لەسەر بوونی ئەمیر فەیسەڵ کوڕی حوسێن بە شای عیراق، بەم جۆرە یەکەم شانۆگەری لەشانۆگەریەکانی سەربەخۆیی بۆ عیراق لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە، وەك ئەکتەرێکی سەرکەوتوو جێبەجێ کرا بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە لەم شانۆگەرییە ئەوەیە:

1) خەڵکی کوردستان لەگەڵ دانانی نەبوون، پشتگیری دانانی ئەمیر فەیسەڵیان نەکرد وەك شای عیراق بەتایبەتی سلێمانیو کەرکوك. سلێمانی بەشداری لە شانۆگەری هەڵبژاردن نەکرد وە کەرکوك لەدژی دەنگیان دا وە موسڵو هەولێریش پشتگیری دانانی فەیسەڵیان کرد بەڵام بە مەرجێك پەیمانی سیڤەر جێبەجێ بکرێ.

2) لەخاڵی یەکەمیش سەرنج ڕاکێشتر، ئەوەیە، وەفدێکی باڵای بەسرە، داوای چاوپێکەوتنێکیان کرد لەگەڵ پرسی کوکسدا و داوایان کرد :

- ئەمیر فەیسەڵ ببێ بەشای هاوبەشی عیراقو بەسرە,
- بەسرە ئەنجومەنی یاسادانانی خۆی هەبێ.
- بەسرە سوپای خۆی هەبێت.
- بەسرە حکومەتی خۆی هەبێ، دەزگای پۆلیسی خۆی هەبێ.
- داهاتی بۆ خۆی بێ بەشداری بکا لەهاوکاری حکومەتی مەرکەزی لەرووی داراییەوە.

3) ئەوانەی پشگیریان لە ئەمیر فەیسەڵ کردبو، مەرجی ئەوەیان هەبوو کە لە ژێر چاودێری حکومەتی بەریتانیدا بن. لەگەڵ ئەو سێ راستییەی سەرەوش، حکومەتەکەی نەقیبو پرسی کوکس رایان گەیاند کە ئەنجامی دەنگدانەکە لە 97٪ بووە بۆ رازی بوون لەسەر کردنی ئەمیر فەیسەڵ بە شای عیراق!

پاشان حکومەتی عیراق رایگەیاند کە 23ی/ئابی/1921 ، رۆژی دانانی مەلیك فەیسەڵ دەبێ لەسەر کورسی شاهانە، وەك شای عیراق. بۆ ئەم مەبەستەش دەعوەتی نوێنەری هەموو لیواکانیان کرد.... لێرەش نوێنەری کەرکوكو سلێمانی ئامادەی ئەم ئاهەنگە نەبوون.

حکومەتی بەریتانیا بۆ بردنەوەی ململانێی خۆی لەگەڵ تورکیای پاش عوسمانیەکان، حکومەتێکی کاتی لەسنوری هەر سێ ویلایەتی موسڵو بەغداو بەسرە دروست کرد، بەناوی حکومەتی کاتی عیراق لە 25/10/1920 بەکردەوە ناوچەکانی ویلایەتی موسڵی خستەسەر ئەو حکومەتە کاتییە، بۆ ئەوەی ئەم حکومەتە جێگیر بکاتو ویلایەتی موسڵ حەلاڵو مسوگەر بکات، حکومەتی تورکیاش لەبەرامبەردا، هەموو توانای خۆی خستەکار لە پێناوی ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتەسەر تورکیا. هەردوولا، حکومەتی بەریتانیاو تورکیا، سەرقاڵی ئامادەکردنی ئاماری نادروستو ساختەو دەستکرد بوون، لەسەر رێژەی نەتەوەکانو لەسەر گۆرینی ناسنامەی هەندێکی وەك یەزیدیو شەبەك لە دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ هەریەکەیان بە رێگەی خۆی بۆ ئەم مەبەستە هەریەکەیان ئامارێکی پێشکەش کرد بەم شێوەیەی خوارەوە:

**خشتەی ویلایەتی موسڵ**

| | هەڵسەنگاندنی رەسمی ویلایەتی موسڵ | سەرژمێری تورکی کە لەلۆزان پێشکەش کراوە | مەزەندەی ئەفسەرە بەریتانییەکان لەساڵی 1919دا | مەزەندەی ئەفسەرە بەریتانییەکان لەساڵی 1921دا | سەرژمێری رەسمی عیراق لەساڵانی 1922 – 1924دا |
|---|---|---|---|---|---|
| کورد | | 263830 | ئەم مەزەندەیە لەسەر بنەڕەتی ئایینە نەك لەسەر بنەڕەتی رەگەز | 424720 | 494007 |
| عەرەب | | 43210 | | 185763 | 166941 |
| تورکمان | | 146 960 | | 65895 | 38652 |
| مەسیحی | | 31000 | | 62225 | 61331 |
| جو | | 18000 | | 16865 | 11897 |
| یەزیدی | | 5037000 | | 30000 | 26257 |
| دانیشتوانی نیشتە جێ | | 170000 | | | |
| دانیشتوانی کۆچەر | | | | | |
| سەرجەم | 828000 | 673000 | 703378 | 785498 | 799990 |

سەرچاوە : مشكلة الموصل – فاضل حسين

گەر هەرسێ ئاماری پەسەندکراوی تورك‌و ئینگلیزو حکومەتی عیراق لەخشتەی سەرەوەدا بەراورد بکەین لەگەڵ یەکتریدا ئەم ڕاستیانەی خوارەوەمان بۆ دەردەکەوێت:

**یەکەم** : بەپێی ئاماری ڕەسمی حکومەتی عیراق، لەنێوان 1922-1924 ژمارەی دانیشتوانی کورد لەویلایەتی موسڵ (494007) کەس بووە، بەڵام بەپێی ئاماری مەزەند کراوی بەریتانیا، ژمارەی دانیشتوانی کورد لەویلایەتی موسڵ لەساڵی 1921 بە(424,720) کەس مەزەندە کراوە، جیاوازی ئەو دوو ئامارە دەکاتە (70287) کەس ...!

**دووەم:** بەپێی ئاماری ڕەسمی حکومەتی عیراق، ژمارەی دانیشتوانی عەرەب لەویلایەتی موسڵ، لەساڵی 1922-1924، ( 166941) کەس بووە، بەڵام ئاماری مەزەندەکراوی دانیشتوانی عەرەب، لەویلایەتی موسڵ، لەلایەن حکومەتی بەریتانیا لەساڵی1921 بە(185783) کەس مەزەندە کراوە، بەجیاوازی (19822) کەسە.

**سێیەم:** هەر سێلا، حکومەتی بەریتانیاو تورکیاو عیراق، یەزیدیەکانیان بە جیاواز لەگەڵ کورددا ئامارکرد، بەپێی ئاماری تورکیا یەزیدیەکان ژمارەیان (18000) کەس بووەو بە پێی ئاماری بەریتانیا (30000) کەس بووەو، بەپێی ئاماری حکومەتی عیراق (26000) کەس بووە، ئەوەش هەر بۆ ئەوە بووە لە ئاماری گشتی کورد کەم بکەنەوە تاڕێژەی دانیشتوانی عەرەب زیاتر دەربکەوێ. کورد بێ یەزیدیەکان لە 61,7٪ دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ بوون، یەزیدیەکانیش بەتەنیا 3,6٪ دانیشتوانی ویلایەتی موسڵن، بەو پێیە ڕێژەی کورد دەکاتە 65,3٪ دانیشتوانی ویلایەتی موسل، ڕێژەی عەرەبیش لەگشت ویلایەتی موسڵ (20,7٪ ) دانیشتوانی ویلایەتی موسڵن.

**چوارەم:** ڕێژەی سەدی دانیشتوانی نەتەوەکانی ناوچەی ویلایەتی موسڵ بەم شێوەیە دەبێت:

| نەتەوەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|
| کورد | ٪7،61 |
| عەرەب | ٪7،20 |
| تورکمان | ٪5 |
| یەزیدی | ٪6،3 |
| یەهودی | ٪5،1 |
| مەسیحی | ٪5،7 |

کوردو یەزیدیەکان ( 61,7٪+3,6٪)= 65,3٪ دانیشتوانی ناوچەکە پێکدێنن ... لێرەدا هیچ بیانویەك‌و پێوانەیەك نییە بۆ لکاندنو لەقاڵب دانی ئەو ڕێژەیە لەمیللەتی کورد (65,3٪)، لەگەڵ نەتەوەی عەرەب کە ڕێژەکەی 20,7٪ دانیشتوانی ناوچەکەن.

## ئاماری لیوای موسڵ:

**خشتەی لیوای موسڵ**

| | هەڵسەنگاندنی رەسمی ویلایەتی موسڵ | سەرژمێری تورکی کە لەلۆزان پێشکەش کراوە | مەزەندەی ئەفسەرە بەریتانییەکان لەساڵی 1919دا | مەزەندەی ئەفسەرە بەریتانییەکان لەساڵی 1921دا | سەرژمێری رەسمی عێراق لەساڵانی 1922 – 1924دا |
|---|---|---|---|---|---|
| کورد | | 000،104 | ئەم مەزەندەیە لەسەر بنەڕەتی ئایینە نەك لەسەر بنەڕەتی ڕەگەز | 820،149 | 900،87 |
| عەرەب | | 000،28 | | 663،170 | 573،119 |
| تورك | | 000،35 | | 895،14 | 757،9 |
| مەسیحی | | 000،31 | | 425،57 | 54934 |
| جو | | 000،18 | | 665،9 | 579،3 |
| یەزیدی | | 000،216 | | 000،30 | 257،20 |
| دانیشتوانی نیشتە جێ | | ؟ | | | |
| دانیشتوانی کۆچەر | | | | | |
| سەرجەم | | ؟ | 378،350 | 468،432 | 964،295 |

**سەرچاوە : مشكلة موصل – فاضل حسين**

ئەوەی لەئاماری لیوای موسڵ ورد بێتەوەو بەوردی بەراوردی ئاماری ساڵەکانی 1921،1919، 1922 –1924، بکات کە لەسەردەستی حکومەتەکانی عوسمانی، بەریتانیو حکومەتی عیراقدا ئەنجام دراوە، ئەم چەند راستییەی بۆ ئاشکرا دەبێت:-

**یەکەم:** حکومەتی عیراق، بەگوشارو دەسیسەی حکومەتی بەریتانیاو، لەرێگەی حزبی (ئیستقلال)ەوە ترسو فشاری زۆری خستوتە سەر کوردەکان لەویلایەتی موسڵ، بۆ ئەوەی خۆیان تۆمار نەکەن بەکورد (ئەمە رای روونو ئاشکرای لیژنەی کۆمەڵەی گەلانە – تایبەت بەکێشەی ویلایەتی موسڵ لەنێوان تورکیاو بەریتانیا).

ئەنجامی ئەم گوشارو ترساندنەش، هەم ئەنجامی ئامارەکەی گۆڕی لە (149,820) کوردەوە لەساڵی 1921، بۆ (87900) کورد لەساڵی 1922-1924 لەبری ئەوەی کورد لەنێوان ئەو یەك - دوو ساڵەدا زیادبکات کەچی رێژەی کورد (61920) کەسی کەمی کردوە. ئەمە لەلایەكو، لەلایەکی تر، ئەنجامی ئەم هەڕەشەو گوڕەشەیە، کاریکردە سەر گۆڕینی رای خەڵکی کورد لەلیوای موسڵ لەکاتی هەڵبژاردنی شای عیراق . لێرەش فشاری زۆریان خستەسەر کوردەکان بۆ ئەوەی پشتگیری لەدانانی ئەمیر فەیسەڵ بکەن وەك شای عیراق، لەکۆتایی ساڵی 1921. بەم شێوەیە کوردەکانی لیوای موسڵ لەنێوان هەڕەشەی تورکیاو ئینگلیزدا ئازاد نەبوون لەهەڵبژاردنو دەنگداندا.

**دووەم :** لەبەرامبەر کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی کورد لەلیوای موسڵ، حکومەتی بەریتانیا، رێژەی دانیشتوانی عەرەبی، زۆر زیاتر مەزەندە کردوە لەوەی حکومەتی عیراق ئاماری کردوە، حکومەتی بەریتانیا لەساڵی 1921 ژمارەی دانیشتوانی عەرەبی لەلیوای موسڵ بە (170,663) عەرەب مەزەندەکردوە، کەچی حکومەتی عیراق دوای یەك - دوو ساڵ، و لەساڵی 1922-1924، دانیشتوانی عەرەبی لەلیوای موسڵ بە(119537) عەرەب ئەژمار کردوە، جیاوازی ئەم دوو ئامارەش (170663-119537)=51,126 کەسە.■

پەراوێزەکان

1) العراق في الوثائق القديمة (1905-1930)

2) مشكلة موصل - د. حسين فاضل
3) مشكلة موصل – د. فاضل حسين
4) تاريخ الوزارات العراقية- السيد عبد الرزاق الحسنى – المجلد الاول
5) هەمان سەرچاوە
6) هەمان سەرچاوە
7) ماذا في كركوك : فهمي عرب اغا و فاضل محمد ملا مصطفى
8) تاريخ الوزارات العراقية- السيد عبدالرزاق الحسنى – المجلد الاول
9) هەمان سەرچاوە
10) مشكلة موصل – د. فاضل حسين

# 80 ساڵ تەعریبکردنی کوردستان

جەلال جەوهەر عەزیز

## بەشی دووەم

**تەعریب:** پرۆسەیگۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییو نیشتمانی هەر نەتەوەیەك، بۆ سەر ناسنامەی نەتەوەییو نیشتمانی عەرەب، بەشێوازی جۆراوجۆر، جارێکیان بەفریودانو هەڵخەڵەتاندنو دەست برین، جارێکی تر بەپشتگوێ خستنو چاوسورکردنەوەو ترساندنو تۆقاندنو زەبروزەنگو لەناودان. دەکرێ وەك سێ بەش باسی لێوە بکرێ:-

ا - بەعەرەب کردنی خاكو نیشتمان داگیرکردنی خاكو نیشتمانی نەتەوەیەك (وەکو نەتەوەی کورد) ،و دەست بەسەرداگرتنی خاكو ئاوو سەروەتو سامانی ئەو خاكو نیشتمانە (وەکو کوردستان) ، لەلایەن داگیرکەرو دەسەڵاتێکی عەرەبییەوە... بەرێگاو بیانووی جۆراوجۆری سیاسیو ئابووریو ئەمنیو...هتد، نەهێشتنو سڕینەوەی هەموو روخسارێکی ئەو نیشتمانە، لەناوی نیشتمانو جوگرافیاو ناوی شارو شارۆچکەو گوندو چەمو کانیو شیوو شاخو دۆڵو رووبارو...هتد، و گۆڕینی بەناوی عەرەبی، ئەم پرۆسەیە بە عەرەبکردنی کوردستانە.

ب - بەعەرەب کردنی نەتەوەکان... تواندنەوەو قووتدانو سڕینەوەی نەتەوەکانی تر(وەکو نەتەوەکانی کوردو تورکمانو ئاسووری) لەلایەن دەسەڵاتی نەتەوەی عەرەبی داگیرکەرو باڵادەست، نەهێشتنو سڕینەوەی هەموو جۆرە روخسارێکی ئەو نەتەوەیە، لەناوی نەتەوەکەو زمانو کەلتوورو مێژوو...هتد، وە گۆڕینی بەناوی عەرەبی، ئەم پرۆسەیە بە عەرەبکردنی نەتەوەی کوردو تورکمانو ئاسورییە.

ج - حاڵەتی بەعەرەب بوونیش هەیە... ئەویش لەئەنجامی تێکەڵبوونو بەیەکەوە ژیانی کەسو خێزان، یان تێکەڵبوونی رێژەیەکی کەم لەنەتەوەیەك بەنەتەوەیەکی گەورەو زۆرتر وەکو نەتەوەی عەرەب... بەهۆی کەمی لەژمارەو بەهۆی تایبەتمەندی سیستمی داسەپاوی ئابووریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری، هەروەها لەژێر کاریگەری باری ئاینیو مەزهەبی نەتەوەی عەرەب. ئەنجام بەشێوەیەکی سروشتی ئەو نەتەوە بچووکە زۆربەی یان هەموو بنەماکانی نەتەوەیی خۆی لەدەست دەداو ئەتوێتەوە لە ناو ئەو نەتەوە گەورەیەدا.

لەپێناو بەعەرەب کردنی نەتەوەکانی تری عیراقو کوردستان بەتایبەتی، لەکوردو تورکمانو ئاسوری، داگیرکەری بەریتانیو حکومەتەکانی دەسەڵاتداری عەرەب لەعیراق، هەموو جۆرە رێگایەکیان گرتۆتە بەر.

**قۆناغی یەکەم:-**

ئەم قۆناغە لە داگیرکردنی کوردستانی باشورەوە (ویلایەتی موسڵ) دەست پێدەکات، تا بەرەسمی کوردستانی باشور خرایە سەر دەوڵەتی عیراقی تازە دروستکراو، بە بریارێك لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لە 16/12/1925دا.

داگیرکەری بەریتانیو فەرەنسیو روسیو هاوپەیمانان، بەحسابی ئەوە هاتبوون بۆ ناوچەکە، کە رزگارکەری میللەتانی ناوچەکە بن، لەزوڵمو ستەمی داگیرکەری عوسمانی... ئەوەبوو دوای وەعدو بەڵێنی زۆر، کە لەژمارەیەکی زۆر لەرێکەوتنە نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە، وەك پەیمانی سیڤەرو هتد، بەڵام بۆ کورد هەمووی مایە پووچ دەرچوو و بگرە میللەتی کورد زەرەرو زیانی گیانیو ئابووریو سیاسی زۆریشی لێ کەوت. ئەنجامەکەی کوردستانیان داگیر کردووە، بەڵام ئەمجارەیان لەجیاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، داگیرکەری بەریتانی بوو، وە میللەتەکەش بەبن دەستی مایەوە لەژێر چەپۆکی ئینگلیزو دەسەڵاتی عەرەبی تازە دروست بوو لەعیراق. بەو شێوەیە بەشێکی کوردستانیان لکاندە هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرەی عەرەبیو دەوڵەتی عیراقیان لێ دروست

کرد... بەو جۆرە داگیرکەری بەریتانی هەموو کوردستانی خوارووپان لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی عەرەبیدا لەقاڵبداو تەعریبییان کرد... لەگەڵ داگیرکردنو دروست بوونی دەوڵەتی عیراق خاکی باشووری کوردستان خرایە سەر خاکی هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە، لەچوارچێوەی یەك نەخشەدا بەناوی دەوڵەتی عیراق ناسرا، نەخشەی کوردستان سڕایەوە لەنەخشەی ناوچەکەو تەعریب کراو زمانی عەرەبییان داسەپاند بەسەر میللەتی کورددا و زمانی ئیدارەو حکومەت بوو بە زمانی عەرەبیو زمانی کوردی بوو بە زمانی لاوەکی لەکوردستان. مێژووی عەرەبو کەلتووری عەرەب، جێگای مێژووی کوردو کەلتووری کوردیان گرتەوە لەکوردستان. سیستەمی ئابووریو کۆمەڵایەتی داسەپاند بەسەر سیستەمی ئابووریو کۆمەڵایەتی لەکوردستانو جێگای گرتەوە. بەم جۆرە هەموو بنەماکانی نیشتمانیو نەتەوەیی کورد بڕیاری تەعریب کردنی درا. ئەوەی لەباسکردنی ئەم قۆناغەدا دەبێ لەبیر نەکرێ، ئەوەیە، هەر لەسەرەتای ڕاگەیاندنی وەستانی جەنگی جیهانی یەکەمو، سەرهەڵدانی کێشەی ویلایەتی موسڵ، تا ساڵی 1925، هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عیراق زۆر بەگەرمی خەڵکی عەرەبیان هاندا بۆ غەزووکردنی کوردستانی باشورو، ئاسانکاری زۆریشیان بۆ کردن لەم ڕووەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو، نفوزی عەرەب زیاد بکات لەکوردستانی باشور، بەوجۆرە هەم زەمینەی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی عیراق دروست دەبێو، هەم بردنەوەی ویلایەتی موسڵ لەشەڕو ململانێدا، لەگەڵ تورکیا مسۆگەرتر دەبێ.

**قۆناغی دووەم** (1925-1957):

داگیرکەری بەریتانی، تەنیا بەوەوە نەوەستا، کەکوردستانی خوارووپان بەگشتی داگیرکردو، بەزۆر لکاندیان بەهەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرەوە، دەوڵەتی عیراقیان لێ دروست کرد، بەڵکو ئەمجارەیان، ئینگلیز کەوتە نەخشەکێشان بۆ ڕژێمی پاشایەتی، کە چۆن وردەکاری پرۆسەی تەعریب جێبەجێبکەن لەناوچەکە. سنوری نێوان کوردستانی خواروو، لەگەڵ سنووری ویلایەتی بەغدا، بەدرێژایی هێڵی نێوان ئەو دوو ناوچەیە، هەر لەناوچەکانی مەندەلیو خانەقینو دوزو خوارووی کەرکوکو خوارووی ناوچەی مەخمور، تا دەگاتە ناوچەی سنجار، کەوتنە بەرنامەی قۆناغی دووەمی ئەم هەڵمەتەوە. سەرەتا ئەو ناوچانەیان لەبەرچاو گرت کە گرنگی ئابووری هەبوو بەتایبەتی لەرووی کشتوکاڵیو پیشەسازییەوە کە بریتی بوون لەم ناوچانە: . ( خانەقین، جەلەولا، ناوچەی زەنگاباد، پالانی، قەرەتەپە، جەبارە، ناوچەکانی خوارووی دوزو خوارووی ڕۆژئاوای کەرکوك کە بەشێکی داقوقو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کەدوای چلەکان ناویان لێ نا حەویجە، هەروەها ناوچەی قەراجو کەندیناوەوگوێر لەسنوری قەزای مەخمور،و ناوچەکانی سنووری سنجار). خاوەندارێتی زەویو زارو ئاوی ئەم ناوچانەش بەگشتی کورد بوون، جگە لەهەندێ بنەماڵەی تورکمان نەبێت لەسنووری کەرکوك، بەم شێوەیە بوو:-

*خاوەندارێتی زەویو زارو ئاوی ناوچەی خانەقینو جەلەولاو زەنگاباد و قەرەتەپە، دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتو بنەماڵەکانی، دەلۆ، جاف، تاڵەبانی، بابانی، زەنگەنە، گێژ، ئەرکەوازی، فەیلیەکان، هتد..

*خاوەندارێتی زەویو زارو ئاوی ناوچەی کەرکوكو دوزو داقوقو ناوچەی حەویجە، دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتو بنەماڵەکانی کاکەیی، تاڵەبانی، جاف، بابانی، داودە، بنەماڵەی شێخ ئەحمەدی خانەقا، زەنگەنە، دەلۆ، شوان، ساڵەیی، جەباری، شێخان، شێخەکانی بەرزنجەو شێخ بزێنی.... هەندێ بنەماڵەی ناسراو بەتورکمان وەك یەعقوبی، ئاوچی، نەفتچی. بەگزادەکانی جاف تەنیا لەسنوری سلێمانی وکەرکوكودیالەو (539333) دۆنم زەویان هەبوو. کاکەییەکان (سید رۆستەم سەید محەمەد) تەنیا لەکەرکوك ( 191039) دۆنم زەویان هەبوو. تاڵەبانییەکان، تەنیا لەکەرکوكو دیالە (137153) دۆنم زەویان هەبوو. بابانییەکان، تەنیا لەسنووری کەرکوكو دیالە (81358) دۆنم زەویان هەبوو و سەیدەکانی بنەماڵەی سەید ئەحمەدی خانەقا، تەنیا لەکەرکوكو ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك (42351) دۆنم زەویان هەبوو.

*خاوەندارێتی زەویو زارو ئاوی ناوچەی قەراجو کەندیناوەو گوێر، دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتو بنەماڵەکانی دزەییو سیانو مامەسێنیو بندیان، فەقێملکی، ئومەرمەیل، پالانی، سنجاری، سارمەمی، ساڵەیی، لەك، باجەلان، سەیدەکان، شێروانی، ئورمزیار، تایەفەی پاشا، برایم ئاغا، ئال کوتکی، کاکەیی، شێخان، مەرزان، گەردی، شێخ مەموندی.

*خاوەنداریەتی زەوی و ئاوی ناوچەی موسڵ و سنجار بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ کوردەکان، لەبنەماڵەو عەشیرەتەکانی سلیڤانی و یەزیدیەکانی ناوچەی موسڵ و سنجار بەتایبەتی، وەك: شەمدین ئاغای سلیڤانی کە تەنیا لەناوچەی موسڵ (53040 ) دۆنم زەویان هەبوو، ناسر میرزا لەشێخەکانی یەزیدی، تەنیا لەسنووری موسڵ (47358) دۆنم زەویان هەبوو، وبنەماڵەی چادر لەموسڵ و بەغدا (59340) دۆنمیان هەبوو.

## هەڵمەت و غەزووی خێڵە عەرەبەکان دوای هاتن و دانانی مەلیك فەیسەڵ دەستی پێکرد بۆ کوردستان و بەم شێوەیە :

### 1-لیوای دیالە( بەعقوبە )

گۆڕینی باری دیمۆگرافی لەم ناوچەیەو لەقۆناغی دووەم زیاتر لە پرۆسەی بەعەرەب بوون دەچێ، لەوەی بەعەرەب کردن بێ، لە شارو شارۆچکەو گوندەکانی ناوچەی دیالە، وەك خانەقین و جەلەولا (قەرەغان) و سعدیە (قزلرباط) مەندەلی و شارەبان و هتد...

پرۆسەی تەعریب لەم ناوچەیە، لەقۆناغی دووەم تایبەتمەندی خۆی هەبووە، ئەویش ئەوەیە، لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە زۆربەی هەرە زۆریان لە کوردو عەرەب و تورکمان، شیعە مەزهەبن، بۆیە ئەو پەیوەندییە ئاینییەو مەزهەبییە، رۆڵی زۆری هەبوو بۆ تێکەڵبوون و بەیەکەوە ژیان. مەزهەب و زمانی مەزهەب رۆڵی دیاری هەبوو بۆ ئەوەی کەلتووری ناوچەکە رووەو کەلتووری عەرەبی بچێ، بەشێوەیەکی سروشتی تا رادەیەك، بەتایبەتی لە قۆناغی دوەمی پرۆسەی تەعریبدا.

خشتەی پرۆسەی تەعریب کردنی ناوچەکانی لیوای دیالەیە، قەزای خانەقین.:-

خشتەی ژمارە – 1 –

پرۆسەی تەعریبکردنی قەزای خانەقین

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتن | ئەو ناوچەیەی لێی نیشتەجێ بوون | ژمارەیان لە ئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەوییەی داگیریان کردووە |
|---|---|---|---|---|
| جبور | 1957 - 1925 | خانەقین-سعدیە-کوردرە | 850 | 25 کم$^2$ |
| الصمیدع | 1957 - 1925 | خانەقین-سعدیة-الاجبور-بئرقلاب-سینیة | 330 | 25 کم$^2$ |
| الصاجرة | 1957-1925 | خانەقین-سعدیە | 500 | 15 کم$^2$ |
| کعب | 1957-1925 | گوندی گاطع سالم | 100 | 4 کم$^2$ |
| کــــۆ | | | 1780 | 69 کم$^2$ |

خشتەی ژمارە (2)

پرۆسەی تەعریبکردنی قەزای مەندەلی

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتن | ئەو ناوچەیەی لێی نیشتەجێ بوون | ژمارەیان لە ئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەوییەی داگیریان کردووە |
|---|---|---|---|---|
| ابو حداد | 1957 – 1925 | مندلي-الطحماية | 1394 | 6000 دونم |
| ساعده | 1957 - 1925 | مندلي-الطحماية | 1826 | 4860 دونم |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| الحامد | 1925 - 1957 | مندلي-الطحماية | 4700 | 2000 دونم |
| الندا | 1925 - 1957 | مندلي-النفط | 2055 | 10000 دونم |
| المعلا | 1925 - 1957 | مندلي-ترساق | 1110 | 3000 دونم |
| الحمد | 1925 - 1957 | مندلي-ترساق | 0735 | 600 دونم |
| عوادل | 1925 - 1957 | مندلي-الطحماية | 0363 | 1000 دونم |
| البوفرج | 1925 - 1957 | مندلي-ترساق | 0283 | 1200 دونم |
| بني عكية | 1925 - 1957 | مندلي-عمريات | 0245 | 1200 دونم |
| الحريث | 1925 - 1957 | مندلي-دجلة | 0264 | 1600 دونم |
| زهرية | 1925 - 1957 | مندلي-نهر ديردى | 0217 | 1600 دونم |
| المسعود | 1925 - 1957 | مندلي-دجلة | 0295 | 1600 دونم |
| ردينية | 1925 - 1957 | مندلي-دجلة | 1947 | 600 دونم |
| دلفية | 1925 - 1957 | مندلي-دجلة | 1125 | 300 دونم |
| صكور | 1925 - 1957 | مندلي-الطحماية | 0200 | 900 دونم |
| العمار | 1925 - 1957 | مندلي-الطحماية | 01850 | 800 دونم |
| خزرج | 1925 - 1957 | مندلي-عين السبع | 0107 | 800 دونم |
| بني زيد | 1925 - 1957 | مندلي-عين السبع | 0093 | 800 دونم |
| كــــۆ | | | 18809 | 38860 دونم |

خشتەی ژمارە –3-

تەعریبکردنی قەزای مقدادیە (شارەبان)

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتن | ئەو ناوچەیەی لێی نیشتەجێ بوون | ژمارەیان لە ئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەوییەی داگیریان کردووە |
|---|---|---|---|---|
| بنی تەمیم | 1925-1957 | مقدادية، العزية، الركنية، الهارونية، شاخة المقدادية | 3500 | 20 دونم |
| جبور | 1925-1957 | المقداديه، هارونيه، حنيس، سنسل، قلعه، بزايز الشاخه | 3000 | 20 دونم |
| البو فرج | 1925-1957 | المقداديه، الهارونيه | 0200 | 15 دونم |
| مهداوية | 1925-1957 | المقداديه، الجزيره، بلور، قزلچه | 0500 | 10 دونم |
| عگيدات | 1925-1957 | المقداديه، سنسل، شاخه المقداديه | 0200 | 25 دونم |
| | | | 7400 | 90 دونم |
| کۆ | | | 16757 | 180 دونم |

## 2-لیوای کەرکوك:

بەرنامەی پرۆسەی تەعریب، بۆ ناوچەی کەرکوك گەرمتر لەبەرچاو گیراو، وردەکاریەکانی خێراتر جێبەجێکرا، لەبەر کۆمەڵێك هۆ:-

1- لەبەرئەوەی ناوچەی کەرکوك، ناوچەیەکی دەوڵەمەند بوو لەڕوی ئابورییەوە گەورەترین کانەکانی پترۆڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەوێتە ئەو ناوچەیەوە. جگە لەمەش ناوچەیەکی کشتوکاڵی گرنگ بوو بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر لەسەرچاوەی ئاویی هەمیشەیی، وەك زێی بچوكو زێی سیروانو ئاوەسپیو ئاوی ڕۆخانەو چەمی خاصەو چەندین سەرچاوەی ئاوی بچوکتر. کە ئەمەش

بۆخۆی ناوچەکەی دەوڵەمەندتر کردبوو، هەم بۆ بەرهەمی کشتوکاڵی وەك گەنم و جۆو نۆك و نیسك و ... هەم وەك لەوەڕگایەك بۆ ئاژەڵداری.

ئەمانەی سەرەوە، فاکتەری بەهێزو بنچینەیی بوون بۆ داگیرکردن و غەزوکردنی ئەم ناوچەیە، لەلایەن بەریتانیاو حکومەتی پاشایەتی لە عیراق.

2- ناوچەی کەرکوك، جگە لە کوردو تورکمان، هیچ نەتەوەیەکی تری تێدا نەبوە هەر بۆیە لە هەڵبژاردنی فەیسەڵ بۆ شای عیراق، خەڵکی ناوچەی کەرکوك، بەکوردو تورکمانەوە لەدژی دانانی فەیسەڵ دەنگیاندا.

ئەم تاقیکردنەوە تاڵەی حکومەتی بەریتانیاو شا فەیسەڵ لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە، جگە لە هەڵگرتنی رق و قین لەخەڵکی ناوچەی کەرکوك. کەوتنە داڕشتنی بەرنامەیەك بۆ گۆڕینی باری نەتەوەیی لە ناوچەکە.

3- سەرهەڵدانی شۆڕشی شێخ مەحمود، لە سلێمانی و ناوچەکانی و، هاوسنوری سلێمانی و کەرکوك، ئەوەندەی تر، حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عیراقیان ترساند، لەتەشەنەکردنی شۆڕشی کوردو مەترسیەکانی ئەم شۆڕشە بۆ سەر بەرژەوەندی بەریتانیا.

4- لەئاستی دەرەوەش، کێشەی ویلایەتی موسڵ، لەنێوان حکومەتی تورکیا لەلایەك و، حکومەتی بەریتانیاو عیراق لەلایەکی‌تر، ناوەڕۆکەکەی کێشەی کەرکوك و گرنگیە ئابوورییەکەی بوو، ناکۆکی و ململانێی زۆری لەسەرکرا، کە تا ئەمڕۆ پاشماوەی ئەو کێشەیە هەر ماوە!

حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عیراق بۆ راستکردنەوەی تەرازوی نەتەوەیی لەم ناوچەیەو بۆ پاراستنی بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری خۆیان:

1- ژمارەیەکی زۆر لەعەشیرەتەکانی عەرەبی جبورو عوبێدو ئەلبوحەمدان و بەیاتیان هاندا بۆ ناوچەکەو، بەپشتگیری و یارمەتی مادی و مەعنەوی زۆرەوە.

2- دانان و جێگیرکردنی هێزێکی سەربازی، لە هێزی حکومەتی بەریتانیاو حکومەتی عیراق، هەم بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەو هەم بۆ بەرگریکردن و بەرپەرچدانەوەی هەموو جوڵانەوەیەکی چەکدارانە لە ناوچەکە.

3- هەر لەگەڵ دروست بوونی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك ساڵی (1925)، (2500) کارمەندیان دامەزراند لە عەرەب و ئاسووری و رێژەیەکی کەمی کورد. زۆربەیان عەرەب و ئاسووری و ئەرمەنی بوون، ئەو ئاسووری و ئەرمەنیانە، ئەوانە بوون کە لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی جیهانیی یەکەم، ئاوارە بوون لەسەر دەستی حکومەتی تورکیا بۆ ناوچەی ئورمیە لەکوردستانی ئێران و لەوێشەوە بۆ کرماشان و دواتریش بۆ ناوچەی دیالە. ئەو ئاوارانە زیاتر لە (50) هەزار کەس دەبوون. جگە لەدامەزراندنی بەشێکی چاکی ئاسووری و ئەرمەنییەکان لەکۆمپانیای نەوتی کەرکوك، بەشێکیشیان وەك هێزی چەکدار لەگەڵ هێزەکانی حکومەتی ئینگلیزو حکومەتی عیراق بەکار دەهێنران بۆ لیدانی هەر جوڵانەوەیەك لەسەر ئاستی عیراق..

حکومەتی عیراق بۆ نیشتەجێ‌کردنی ئەو (2500) کارمەندەی نەوت، چەند گەڕەکێکی بۆ ماڵە عەرەب و ئاسووری و ئەرمەنییەکان لەناو شاری کەرکوك دروستکرد، کە ئەوە سەرەتای نیشتەجێ‌کردنی عەرەب بوو لەسنووری کەرکوك و شاری کەرکوك.

حکومەتی عیراق لەبیستەکانەوە، تاساڵی (1957) ئەم ژمارانەی لەعەشیرەتە عەرەبەکان لەناو شاری کەرکوك نیشتەجێ‌کردو چ وەك جوتیارو، بەیارمەتی زۆر، لەزەوی و ئاو، چ وەك کارمەند لە دەزگاکانی حکومەت، هی ئیداری و عەسکەری و ئەمنی و، بەپشتگیری و هاوکاری و یارمەتی مادی زۆرەوە.

خشتەی ژمارە (4)

تەعریبکردنی شاری کەرکوك

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتن | ژمارەیان لە ئاماری (1957) | بڕی ئەو زەوییەی داگیریان کردووە |
|---|---|---|---|

| | | | |
|---|---|---|---|
| عوبید | -1925 1957 | 5000 | 75 کم$^2$ |
| کضاء | -1925 1957 | 1000 | 50 کم$^2$ |
| حدیدی | -1925 1957 | 500 | 10 کم$^2$ |
| کۆ | -1925 1957 | 6500 | 135 کم$^2$ |

هەروەها لەسالآنی سییەکانو چلەکاندا (2193) کەس لە عەشیرەتەکانی (ئەلبوحەمدانو ئەلبوسماق)ی هێنایە ناوچەی قـەزای دووبزو، لەچەندین گونددا نیشتەجێکران، لەسەر زێی بچوکو (95500)دۆنم زەویان بەسەردا دابەشکرا.

خشتەی ژمارە (5) تەعریبکردنی قەزای دووبز

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتن | ژمارەیان لە ئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەوییەی داگیریان کردووە |
|---|---|---|---|
| ئەلبوحەمدان | -1930 1957 | 1962 | 83000 دونم |
| ئەلبوسماق | -1930 1957 | 0231 | 12500 دونم |
| کۆ | -1930 1957 | 2193 | 95500 دونم |

## قەزای کفری - قەرەتەپە :-

حکومەتی عیراق بۆ سنووری کفریو قەرەتەپە، ژمارەیەکی زۆری لەعەشیرەتە عەرەبەکانی وەك جبور، عوبید، لهیب، بەنی زیـد، الکثیر، الساعدین، بنی عز، النتر، الزبید، العیشین، المعدان، هێناو، لەو سنورە لەسـەر زەویو ئـاوی کـورد نیشـتەجێیکردن، بـەم شێوەیە:

خشتەی ژمارە (6)

تەعریبکردنی قەزای کفری — قەرەتەپە

| ناوی عەشیرە تەکان | ساڵی هاتن | ژمارەیان بە پێی ئاماری ساڵی 1957 | شوێنی نیشتەجێ بوونیان( کفری - قەرەتە پە ) | بڕی زەوی |
|---|---|---|---|---|
| جبور | -1925 1956 | 2635 | کاریز، وادی الغزلان، ابـو عـیره، صـنیار، سعدیه، شیلان، نرکس، کشـکرین جدیـد، صنیدع کبیر، صاری تەپە | 35812 دونم |
| لهیب | -1925 1956 | 1550 | اسکی کوپری، محمود کوڕی عبداالله، عمر مندان العلیا، عمر مندان السفلی، عـدن خشیلات، نظام کلیل تەپە. | 21178 دۆنم |
| عوبید | -1925 | 539 | علی سرای العلیا | 3500 دونم |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | 1956 | | | |
| بنى زيد | 1925-1956 | 739 | طياوى شنشال جديد، جرايات، كەشكول، فدعم | 1000 دونم |
| الكثيرة | 1925-1956 | 359 | خكه، صفصانه، بالنوز ئاغاج | 7500 دونم |
| الساعدين | 1925-1956 | 271 | البلاط الكبير | 7500 دونم |
| بنى عز | 1925-1956 | 259 | زركوش سليم، زركوش حوسين | 2000 دونم |
| النتر | 1925-1956 | 2910 | على سراى السفلى | 3500 دونم |
| الزبيد | 1925-1956 | 525 | كاوخور | 45000 دونم |
| العيشين | 1925-1956 | 215 | قره تباخ | 5000 دونم |
| المعدان | 1925-1956 | 221 | معدان شيخ باب | 4000 دونم |
| الكثيرة | 1925-1956 | 850 | عين شكر | 13250دونم |
| الجبور | 1925-1956 | 2725 | عرجان | 71013 دونم |
| بيات | 1925-1956 | 2375 | پيره فەقيره | 33750 دونم |
| بيات | 1925-1956 | 14514 | قەزاى دووز | 181300 دونم |
| العبيد | 1925-1956 | 1370 | دووز- قريه شبيحه | |
| كۆ | | 32057 | | 435303 دونم |

## کەرکوك - پرۆژەی حەویجە :-

حکومەتی عیراق بۆ نیشتەجێکردنی ژمارەیەکیتر لەعەرەبەکان لەناوچەی رۆژئاوای کەرکوك، پرۆژەیەکی ئاودێری دەست پێکرد. ئەو پرۆژەیە پێی ئەوترێ، پرۆژەی ئاودێری حەویجە، دەکەوێتە رۆژئاوای کەرکوكو، لەنزیکی ناوچەی بەتمە سەرچاوە هەڵدەگرێ. پرۆژەی حەویجە لەساڵی (1936)دا دەست پێکراوە. بۆ دروستکردنی ئەم پرۆژەیە سوودی زۆریان لە زیندانەکانی ئەو سەردەمە بینی، کە بەهۆی جیاجیا زیندانی بوون لە گرتوخانەکانی عیراق، لەساڵی (1940)دا تەواو بووە. ئەو پرۆژەیە لەیەك چرکەدا (15)م$^3$ ئاو ئەدا. ئاو بۆ زیاتر لە(200) هەزار دۆنم زەوی دابین دەکات.

بەتەواوبوونی پرۆژەی ئاوی حەویجە، حکومەتی عیراق، چەندین هەزار ماڵە عەرەبی کۆچەرو دەوارنیشینی هێنا بۆ دەوروبەری ئەو پرۆژەیەو لەدەیان گوندی تازە نیشتەجێ بوونو، زەویان بەسەردا دابەشکرا. عەشیرەتەکان ئەمانە بوون: (عوبید، یەك هەزار کم$^2$ زەویان بەسەردا دابەش کرا، عەشیرەتی جبور (900کم$^2$) زەویان بەسەردا دابەش کرا، عەشیرەتی ئەلبوحەمدان لە(100کم$^2$)دا نیشتەجێکران، زەویان بەسەردا دابەش کرا.... بەپێی ئاماری ساڵی (1957) ژمارەی ئەو کسانەی کە لەو عەشیرەتە عەرەبانەی لەناوچەی حەویجە نیشتەجێ بوون (27705) کەس بوون (عبید 11000 کەس)، (جبور 12595 کەس)، (ئەلبوحەمدان 2140 کەس).

بەڵام بەهۆی هەڵەیەکی هونەری لەپرۆژەکەو، بارانی زۆری ئەو ساڵەوە، ئاوێکی زۆر کۆبوەوە لەدەورووبەری پرۆژەکە بەو شێوەیە، گۆلاوێکی زۆر دروست بوو، کە دواتر بووە سەرچاوەی نەخۆشی مەلاریا، بەمەش، ژمارەیەك لەعەرەبەکان تووشی نەخۆشی مەلاریا بوونو گیانیان لەدەستداو هەندێکیشیان ناوچەکەیان چۆڵ کرد لەترسی نەخۆشی مەلاریا.

حکومەتی عیراق لەپێناوی سەرگرتنی ئەو پرۆژەیەو مانەوەی عەرەبەکان لەناوچەکە، لەساڵی (1943)دا گوندی مەلحە، کە گوندێکی کوردی بوو، کردی بەناحیە، بۆ راپەڕاندنی کاروباری خەڵك لەناوچەکە، پاشان مەرکەزی ناحیەکەی گوازتەوە بۆ گوندی حەویجە کە تازە دروست کرابوو.

**خشتەی ژمارە (7)**

**تەعریبکردنی ناوچەی کەرکوك - حەویجە**

| ناوی عەشیرەتەکان | ساڵی هاتن | ژمارەیان بە پێی ئاماری ساڵی 1957 | شوێنی نیشتەجێ بوونیان | بڕی ئەو زەویەی پێیان دراوە |
|---|---|---|---|---|
| العبيد | 1940 | 11000 | حەویجە لە 124 گوند نیشتەجێ بوون | 1000 کم$^2$ |
| الجبور | 1940 | 12595 | حەویجە لە 85 گوند نیشتەجێ بوون | 955 کم$^2$ |
| ئەلبوحەمدان | 1940 | 2140 | حەویجە لە 14 گوند نیشتەجێ بوون | 200 کم$^2$ |
| التکارتو الدوريين | 1940 | 1970 | حەویجە لە 5 گوند نیشتەجێ بوون | 100 کم$^2$ |
| کۆ | | 27705 | 228 گوند | 3225 کم$^2$ |

**خشتەی ژمارە (8)**

**تەعریبکردنی ناوچەی کەرکوك – داقوق**

| ناوی عەشیرەتەکان | ساڵی هاتن | ژمارە | شوێن | بڕی ئەو زەوییەی پێیان داوە |
|---|---|---|---|---|
| العبيد | 1940 | 1370 | گوندی شەبیحە عبدالعزیز<br>گودی شەبیحە سعود | نەزانراوە |

## 3- ليواى هەولێر:-

هەولێر ناوچەیەکی دەوڵەمەندە لەرووی ئابورییەوە، لەناوچەی هەولێریشدا، ناوچەکانی قەراجو کەندیناوەو گوێر. چونکە هەم ناوچەیەکی کشتوکاڵییە، بەتایبەتی لەدانەوێڵە (گەنم، جۆو، نیسك، نۆك)،و کشتوکاڵی هاوینی، بەهۆی چاکیو پەیتی زەوییەکەی ( بەتایبەتی لەو ساڵانەی بارانی پێویست دەبارێ)و، بوونی سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی، وەك زێی گەورە لەباکورو باکوری رۆژئاوای ناوچەکە بەدرێژایی زیاتر لە (50)کم، زێی دیجلە، لەرۆژئاوای ناوچەکە بەدرێژایی زیاتر لە (100)کمو زێی بچووك، لەباشورو خۆرهەلاتی باشووری ناوچەکە بەدرێژایی زیاتر لە(100) کم، ئەمە جگە لەدەوڵەمەندی بەئاوی ژێر زەمینی. ناوچەی قەراجو کەندیناوەو گوێر، جگە لەدەوڵەمەندی بەکشتوکاڵ، ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندە بەنەوت، بەتایبەتی لەگوندەکانی سەربەشاخو سارەلوو و دەوروبەری مەخمور....

ئەم ناوچەیە لەدێر زەمانەوە، تەنیا میللەتی کورد تیا ژیاوەو، نیشتەجێ بووە. رووباری دیجلە، لەرۆژئاوای ناوچەکە، سنوری نێوان ناوچەی هەولێرو، ناوچەی عەرەب نشینەکان بووە.

مێژووی هاتنی عەرەب، بەشێوەی کۆمەڵ، بۆ ناوچەکانی هەولێرو، بەتایبەتی بۆ قەراجو کەندیناوەو گوێر، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم. کاتێ بەهۆی ئەو شەڕەوە، نەبوونیو قاتوقڕیو بێکاری بڵاوبوەوە، برسیەتی گەیشتە ئەوپەڕی. ولەبەرئەوەی ناوچەی هەولێر ناوچەیەکی کشتوکاڵی دەوڵەمەند بوو، تارادەیەك، بە بەراورد لەگەڵ ناوچە بیابانەکانی عەرەب نشین، لەلیوای موسڵو رومادی بەتایبەتی. مەسەلەی برسیەتیو بوونی ئەو پاشاگەردانیەی بەهۆی شەڕەوە دروست بووبوو، و نەمانی ئیدارەو دەسەلات، بەهۆی سەرقاڵیان بەشەڕی جیهانی یەکەم، لەناوچەکە، زەمینەی خۆش کرد بۆ عەرەبەکانی ناوچەی موسڵو رومادی لەعەشیرەتەکانی شەمەر، جبور، ئەلبوحەمدان، لەنێوان ساڵی (1915-1916)، پەلاماری کوردەکان بدەن، لەناوچەی قەراج، بۆ مەبەستی تالآن کردنی سەروەتو سامانی کوردەکان لەناوچەکە ، ئەم پەلامارو هەڵمەتە چەندبارە بووە، دەرهەق بەگوندە بچووکەکانی ناوچەی ناوچەکە. ئەم هێرشو پەلامارەش بەشێکی کوردەکانی ناوچەی دەشتی قەراجی ناچار کرد، گوندەکانی خۆیان چۆڵ بکەن، بەتایبەتی گوندە بچووکەکانی سەر سنور، کە هەم ژمارەیان کەم بوو، وە هەم ئیمکانیەتی بەرگریان نەبوو، لەچەكو تەقەمەنی. هێرشو پەلاماری عەرەبەکان بە بەردەوامی، بووە هۆی ئەوەی عەرەبەکان گرنگی ناوچەکە بزانن لەرووی ئابوورییەوە،و بەچاوی تەماحو داگیرکردنو مانەوە سەیری بکەن.

دوای دروست بونی دەوڵەتی عیراق، بارەکە بەجارێك وەرچەرخا بۆ بەرژەوەندی عەرەبەکان. چونکە حکومەتی بەریتانیو دەوڵەتی عیراق، بەهەموو توانیان پشتگیرییان لەغەزووی عەرەبەکان دەکرد، نەك هەر بۆ ناوچەی هەولێر، بەلکو بۆ هەموو کوردستانی باشوور (ویلایەتی موسڵ)، بۆ زیادکردنی رێژەی عەرەب لەو ناوچەیە، چونکە حکومەتی بەریتانیاو عیراق پێویستیان بە دەنگو تەئیدی زیاد هەبوو، بۆ یەکلاکردنەوەی شەڕو ململانێی خۆیان لەگەڵ حکومەتی تورکیا، لەسەر ویلایەتی موسڵ.

لەساڵی (1920) عەرەبەکانی ئەوبەری زێی دیجلە، پەلامارێکی تری ناوچەکەیاندا، بەتایبەتی ناوچەی کەندیناوەو ملکیە، بەڵام خەڵکی ناوچەکە بەتایبەتی خەڵکی عەشیرەتی سیان، هێزێکیان ئامادەکرد، لەشکری عەرەبەکانیان شکاندو، هەتا سنووری شەرگات راویان نانو، لەنێوان هەردوو گوندی شەكو یەکاو، تالآنەکانیان لێ سەندنەوە.

دوای جێگیربوونی دەوڵەتی عیراق.... غەزووی عەرەب بۆ ناوچەکە رووی لەزیادبوون بوو، ژمارەیەکی زۆر لەخێڵە عەرەبە کۆچەرەکان، بەپشتگیری حکومەتی عیراق، لەکەناری رووبارەکانی زێی دیجلەو زێی بچووك نیشتەجێ بوون، لەگوندی ئەو کوردانەی، کە بەهۆی هێرشو پەلاماری عەرەبەکان چۆڵیان کردبوو، کە تائەمڕۆش ناوی ئەو گوندانە بەکوردی ماونەتەوە، وەك (داوگەمیر) (عیسا تورك بەشەڕ بەکوردەکانی چۆڵ کرد)، ئومەراوە، باخچە، شەقلاوە، رەنج، ئەستێرۆکە، دووگردان، کەبەرۆك، زوڕنا، پاشبەند، خڕەبەردان، بن دیان، عەلیاوە)، هەندێ لەو عەرەبانەش گوندی تازەیان بۆ خۆیان دروست کرد لەناوچەکە.

خاوەنداریێتی ئەم ناوچەیە، لەزەوی‌و ئاو، هی میللەتی کورد بووە لەعەشیرەت‌و بنەماڵە کوردەکانی ئـەو ناوچـەیە، وەك دەزەیـی‌و بەشەکانی (بایز، مام خولە، فارس، کاکەخان)، ساڵەیی، سـیان، مامـە سـێنی، بنـدیان، لـەك، شـیروانی، ئورمزیـاری، ئومـەربلی، باجلان، پاڵانێ، گەردی، کاکەیی، سیدەکان، مەرزان، شێخ مەمووندی، سنجاوی.....

تـەنیا دزەیـەکان لـەو ناوچـەیە (210781) دۆنم زەویـان هـەبووە، سـاڵەیەکان (330225) دۆنم زەویـان هـەبووە، سـیان (86879) دۆنم زەویان هەبووە، مامەسێنی (35884) دۆنم زەویان هەبووە، هەروەها عەشیرەت‌و بنەماڵەکانی تری زەویان هەبووە بەرێژەیەکی کەمتر بەڵام پاش غەزوکردنی ناوچەکە، جارێکیان بە هێرش‌و پەلاماری عەشیرەتە عەرەبەکان، جـارێکی‌تر بـە هاوکـاری‌و یارمەتی تەواوی حکومەتی بەریتانیاو عیراق، باری دیمۆگرافی ناوچەکە گۆڕانی زۆری بەسەراهات.

**خشتەی ژمارە (9)**

**ئەو عەرەبانەی لەگوندەکانی سەربە مەرکەزی قەزای مەخمور نیشتەجی بوون**

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتنیان | ژمارەیان لەئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەویەی داگیریان کردووە | ئەو ناوچانەی لێی نیشتەجێبوون. |
|---|---|---|---|---|
| 1- ئەلبوحەمدان | 1957-1925 | 392 | 7244 دۆنم | گوندەکانی (سارتك‌و عتیرەو خازر) |
| 2- شلیلە | | 2149 | 53896 دۆنم | ئومەراوە، خڕە بەردان، قودیلە، مەهانـە، سێدارە، کەبەرۆك، عین شەهاب، خالدیە، صلاحیە، عین مەرمیە، عین مۆژان، عین ئەلبو هەدلان، عینکاوە، نعناعە |
| 3- لهیب | 1957-1925 | 578 | 15953 دۆنم | جدیدە، خرابە حاراللە، گبیبە، کەرمردی، خەریانی، رواڵە، خربة محمود، دۆلانگیـو، گردە هارە، لزاگە، عەلیاوە، قەبرسەید |
| 4- سمبس | 1957-1925 | 748 | نەزانراوە | |
| 5- سادات نعیم | 1957-1925 | 171 | 12568 دۆنم | خەندەك، پاشبەند، تل الغزال |
| کۆ | | 4038 | 89661 دۆنم | |

**خشتەی ژمارە (10)**

**ئەو عەرەبانەی لەسنوری قەزای مەخمور – ناحیەی گوێر نیشتەجێبوون، لەساڵانی 1925-1957**

| ناوی عەشیرەتە عەرەبەکان | ساڵی هاتنیان | ژمارەیان لەئاماری ساڵی 1957 | بڕی ئەو زەویەی داگیریان کردووە | ئەو ناوچاناەی لێی نیشتەجێبوون. |
|---|---|---|---|---|
| **سمبس** | 1957-1925 | 306 | 7654 دۆنم | مەرکەزی ناحیەی گوێر+سنووری سلتان عبداللە |
| **جبور** | 1957-1925 | 296 | 7570 دۆنم | مەرکەزی ناحیەی گوێر |
| **لهیب** | 1957-1925 | 1257 | 15411 دۆنم | مەرکەزی ناحیەی گوێر+مەچلوبە+ شمراع+ حمویجە |
| **طی** | 1957-1925 | 777 | 9168 دۆنم | مەرکەزی ناحیەی گوێر+ ئەبو شیتە+ هەریرە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادات نعيم | 1957-1925 | 644 | 14453 دۆنم | مەركەزى ناحيەى گوێر |
| كۆ | | 3280 | 54256 | |

**خشتەى ژمارە (11)**

**ئەو عەرەبانەى لە گوندەكانى سەر بەناحيەى كەنديناوە- قەزاى مەخمور/ نيشتەجێبوون**

| ناوى عەشيرەتە عەرەبەكان | سالَى هاتنيان | ژمارەيان لەئامارى سالَى 1957 | برِى ئەو زەويەى داگيريان كردووە | ئەو ناوچانەى لێى نيشتەجێبوون. |
|---|---|---|---|---|
| بەنى تەميم | 1957-1925 | 130 | 1530 دۆنم | درِكەى گەورە |


**سەرچاوەكان:**

1-د.فاضل حسين - مشكلة الموصل.

2-حنا بطاطو- العراق – تاريخ الطبقات الأجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام جمهورية – الكتاب الأول – ترجمة (عفيف الرزار).

3-عبدالرزاق الحسنى - تاريخ العراق السياسي الحديث – الجزء الأول.

4-الدليل العراقي الرسمي لسنة 1936.

5- ئەمنى ستراتيجى عيراقو سێكوچكەى بەعسيان: تەرحيل، تەعريبو تەبعيس – ئەمين قادر مينە.

6-الدليل العام لتسجيل النفوس العام لسنة 1957، الحكومة العراقية. وزارة الشؤون الأجتماعية – مديرية النفوس العامة.

7-العراق الشمالي – محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن 1954-1955.

8- ژمارەيەك لە كەسايەتى ورياو روناكبيرى ناوچەكە.

## وەڵامی چەند پرسیارێکی تایبەت بە

# پاکتاوکردنی نەژادیی لەکودرستان

جەلال جەوهەر عەزیز

**ئاماژە:** ئەم لێکۆڵینەوەیە پاش دیدارێکی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لەگەڵ بەڕێز جەلال جەوهەر عەزیز هاتە بەرهەمو لەژمارەکانی(2689،2688و2690)ی ڕۆژنامەکەدا بەئەڵقە بڵاوکرایەوە. لەبەر گرنگی بابەتەکە گۆڤاری کەرکوك جارێکی تر دەقەکەی بڵاودەکاتەوە.

حکومەتی عیراق بەرنامەیەکی زەمەنی دیاری کردووە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە, بەمەزەندەی سەرکردایەتی حکومەتی بەعس, دەبوو ئەم بەرنامەیە لەکۆتایی ساڵی 1999و سەرەتایی ساڵی 2000دا جێبەجێ بکرایە. ئەم بەرنامەیە لەستراتیژیەتی حکومەتی عیراقدایە, هەر لەسەرەوە (سەرۆك كۆمار)و جێگری سەرۆك كۆمارو ئەندامانی سەرکردایەتی بەعسو دەزگاکانی حکومەت لەوەزارەتی ناوخۆو پارێزگاکانو مدیری ئەمنی پارێزگاکانو دەزگاکانی موخابەراتو ئیستیخبارات ... هتد, سەرقاڵی جێبەجێ کردنی ئەم بەرنامەیەن، بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی پاکتاوکردنی ڕەگەزی لەکوردستانو دەربەدەرکردنی کوردو کەمینەکانی تورکمانو ئاشوری, جێگری سەرۆك كۆمار یان جێگری بە ناو(سەرکردایەتی شۆڕش) ڕاسپێردراوە کە چاودێری جێبەجێ کردنی ئەم بەرنامەیە بکات. ئەمە بەرنامەی ئەمڕۆ نییە, ئەمەنی سەدان ساڵە, بەرنامەی هەموو دەسەڵاتدارە ڕەگەز پەرستەکانی عەرەب بووە لەکوردستان. هەر لەسەردەمی هاتنی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ, بە بیانووی جۆراو جۆری وەك بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامی لەسەردەمێكو سەردەمێکی تر بەبیانووی ئاوەدانکردنەوە...! بەڵگەش بۆ ئەو ڕاستیانەی سەرەوە:

### یەکەم: لەرووی مێژووییەوە

- هاتنی عەرەب بۆ کوردستان لەدوای ساڵی (16ھ) (596ز) بووە. لە ساڵی (16ھ) بۆ جارییەکەم عەرەب لەموسڵو ناوچەکانی جێگیر بوون. لەساڵی (13ھ) (593ز) بۆ جاری یەکەم عەرەب گەیشتە ناوچەکانی کەرکوكو دیالە.

- پرۆسەی داگیرکردنو ڕاگواستنی کورد لەناوچەکە لەهەموو سەردەمەکانی ئەمەویو عەباسیو ئیلخانیو جەلائیریو سەفەویو عوسمانی هەر بەردەوام بووە. دوای زیاتر لە (1300) ساڵ ڕێژەی دانیشتوانی ولایەتی موسڵ (موسڵ, کەرکوك, هەولێر, شارەزوورو سلێمانی) بەم شێوەیە بوو:

**سەرژمێری دانیشتوان لەولایەتی موسڵ:**

| نەتەوەو کەمینە نەژادیو ئاینیەکان | سەرژمێری تورکی | سەرژمێری بەریتانی 1921 | سەرژمێری رەسمی عیراقی 1922-1924 | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|---|---|
| کورد | 263830 | 424720 | 494007 | ٪61.7 |
| عەرەب | 43210 | 185763 | 166941 | ٪20.7 |
| تورکمان | 146960 | 65895 | 38625 | ٪5 |
| مەسیحی | - | 62225 | 61331 | ٪7.5 |
| جوو | 31000 | 16865 | 141897 | ٪1.5 |
| یەزیدی | 18000 | 30000 | 26257 | ٪3.6 |
| **کۆی گشتی** | 703378 | 785498 | 799990 | |

بەپێی سەرژمێری حکومەتی عیراق لەساڵی (1922-1924) ژمارەی دانیشتوانی عەرەب لەهەموو ولایەتی موسڵ (166941) کەس بووە, بەپێی سەرژمێری بەریتانی ژمارەیان (185763) کەسو بەتەقدیری تورك ژمارەی عەرەب (43210) کەس بووە. بەو پێیە رێژەی عەرەب (٪20.7) دانیشتوانی ناوچەکە بوون. رێژەی (کورد + یەزیدی) (٪65.3) دانیشتوان بوون لەولایەتی موسڵ.

بەڵام پرۆسەی پاکتاوکردنی رەگەزی لە لیوای موسڵ زیاد چووە پێشەوە, لەماوەی (1300) ساڵ دانیشتوانی عەرەب یەکجار زیادی کرد لەشاری موسڵو ناوچەی موسڵو بەم شێوەیە:

**سەرژمێری دانیشتونی لیوای موسڵ:**

| نەتەوەو کەمینە نەژادیو ئاینیەکان | سەرژمێری تورکی | سەرژمێری بەریتانی 1921 | سەرژمێری رەسمی عیراقی | رێژەی سەدی٪ بەتەقدیری عیراقی |
|---|---|---|---|---|
| کورد | 104000 | 149.820 | 87.900 | ٪29.69 |
| عەرەب | 28000 | 170663 | 119573 | ٪40.40 |
| تورکمان | 35000 | 14895 | 9757 | ٪3.29 |
| مەسیحی | 31000 | 57425 | 54934 | ٪18.54 |
| جوو | 18000 | 9665 | 3579 | ٪1.2 |
| یەزیدی | 16000 | 30000 | 20257 | ٪6.84 |
| **کۆی گشتی** | 350278 | 432498 | 295964 | |

لەخشتەی لیوای موسڵ دەردەکەوێ کە رێژەی دانیشتوانی عەرەب دوای زیاتر لە (1300) ساڵ بۆتە (٪40.40) رێژەیدانیشتوانی کورد بە یەزیدیەوە (کە ئەوان بە جیا لەکورد ئاماریان کردووە) کەم بۆتەوە بۆ ٪36.54 دانیشتوانی لیوای موسڵ.

*** لیوای هەولێر**

هەولێریش وەك هەموو ناوچەكانی تری كوردستان بەر شاڵاوی پاكتاوكردنی رەگەزی كەوت, بەتایبەتی ناوچەكانی خوارووی هەولێر, كە ناوچەكانی (دیبەگە, كەندیناوەو مەخمور) دەگرێتەوە. سەرەتای ئەم پاكتاوكردنی رەگەزییە دەگەرێتەوە بۆهاتنی لەشكری ئیسلام بۆ ئەم ناوچەیە لەسەردەمی هەڵمەتی بلاوكردنەوەی ئاینی ئیسلام, رێژەیعەرەب لەم ناوچەیە دوای سەدان ساڵ زیادی كردووە, لەئاماری ساڵی (1921)دا بەم شێوەیە بووە:

**سەرژمێری دانیشتوانی لیوای هەولێر لەساڵی 1921 :**

| نەتەوەو كەمینە نەژادیو ئاینییەكان | ژمارەی دانیشتوان | رێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|
| عەرەب | 11.700 | ٪6 |
| كورد | 170.750 | ٪88.9 |
| تورك | 2.780 | ٪1.44 |
| مەسیحی | 3.900 | ٪2 |
| جوو | 2.750 | ٪1.43 |
| **كۆی گشتی** | 191.880 | |

دیارە پێش ئەم هەڵمەتە, كەمو زۆر عەرەب لەسنوری هەولێردا نەبوە, بەلام دوای سەدان ساڵ ژمارەیان گەیشتە (11700) كەس لەسنوری هەولێر.

***لیوای كەركوك و دیالە**

سەبارەت بەم ناوچەیە, عەرەب بۆ جاری یەكەمو لەسەردەمی ئیسلام گەیشتە ئەم ناوچەیە. لەساڵی (22ه) (602ز) گەیشتە ناوچەی شارەزور, كە كەركوكو ناوچەكانی بەشێكی سنوری ناوچەی شارەزور بوون, لەساڵی (16ه) (596ز) گەیشتە ناوچەكانی دیالەو جەلەولاو حەلوانو خانەقین. پێش هاتنی ئیسلام, كەمو زۆر عەرەب لەسنوری كەركوكو دیالە نەبوو.

ناوچەی كەركوك لەماوەی حوكمڕانی سەردەمی سەرەتای ئیسلامو ئەمەویو عەباسیو سەفەویو عوسمانیدا ئاڵوگۆری زۆری بەسەردا هاتووە.

**لەئاماری ساڵی 1921 كە لەچوارچێوەی كێشەی ویلایەتی موسڵ ئە نجام درا بەم شێوەیە بوو:**

| نەتەوەو كەمینە نەژادیو ئاینییەكان | ژمارەی دانیشتوان | رێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|
| عەرەب | 35650 | ٪31.9 |
| كورد | 47500 | ٪42.54 |
| تورك | 26100 | ٪23.37 |
| مەسیحی | 2400 | ٪2.14 |
| **كۆی گشتی** | 111650 | |

كە بەتەقدیر ئەم ئامارە زۆر دوورە لەراستی چونكە هەرچۆنێك حیسابی بۆ بكەین لەگەڵ ئاماری ساڵی 1957 یەك ناگرێتەوە, كە دواتر باسی لێدەكەین.

سەبارەت بەپرۆسەی پاكتاوكردنی رەگەزی لەسنوری لیوای دیالە, لەماوەی هاتنی ئاینی ئیسلام تا جەنگی یەكەمی جیهانی ئاڵوگۆری زۆری بەسەردا هات, پاكتاوكردنی رەگەزی لەو ناوچەیە وەك ناوچەی موسڵ, زۆر چووە پێشەوە, لەبەرهۆی سیاسیو مەزهەبیو ئابوری ... ئەو ناوچەیە مەیدانی رووبەروو بونەوە بووە لەچوار سەد ساڵی رابووردو, بەتایبەتی لەسەردەمی شەڕو

ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی (سونە مەزهەب)و, دەوڵەتی سەفەوی (شیعەمەزهەب) لەئێران. بەهۆی ئەوەی هەموو نەتەوەکانی ناوچەکە تا رادەیەك لەعەرەبو کورد شیعە مەزهەب بوون, بۆیە هاتنی عەرەب بۆ ئەو ناوچەیە بەحاڵەتێکی ئاسایی تر وەرگیراوە, تا گەیشتە ئەوەی عەرەب بوون بەزۆرینە لەناوچەکە لەچاو کوردو تورکمان, هۆیەکی تر, ئەوەیە, ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی کشتوکاڵییەو زۆر بە پیتە, بەهۆی بوونی سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی, ئەمیش هۆیەکی گرنگە بۆ هاتنو راکێشانی عەرەب بۆ ناوچەکە,

ئەمە جگە لەدۆزینەوەی نەوت لەناوچەی خانەقین لەدوای یەکەم شەری جیهانی، کە ئەمیش بووە هۆی ئەوەی دەسەڵاتداران, لەرەگەزپەرستی عەرەب, عەرەبی ناوچەکانی خواروو ناوەڕاست هان بدەن بۆ کۆچ کردن بۆ ئەو ناوچەیە!

**پرۆسەی پاکتاوکردنی رەگەزی لەناوچەکانی دیالە , خانەقین, مەندەلی, شارەبان (مقدادیە ) لەماوەی نێوان ساڵی 1925 تا ساڵی 1957 بەم شێوەیە بووە:**

| ناوچە | ژمارەی عەرەبی هاتوو | ساڵی هاتنی عەرەب | بڕی ئەو زەویەی لەلایەن عەرەبەکانەوە داگیر کرا |
|---|---|---|---|
| خانەقین | 1780 | 1925-1957 | 69کم$^2$ (بەکیلومەتری چوارگۆشە مەزەندە کراوە) |
| مەندلی | 18809 | 1925-1957 | 38860 کم$^2$ دۆنم (بە دۆنم تەقدیر کراوە) |
| شارەبان | 16757 | 1925-1957 | 180 دۆنم |
| **کۆی گشتی** | 37346 | | |

لەماوەی نێوان ساڵی 1925 تا ساڵی 1957, کە 32 ساڵ دەکات (37346) کەسی عەرەب لەناوچەی دیالە نیشتەجێ بوون.

پاکتاوکردنی رەگەزی, بەو پێیەی باسی لێوە کرا بەژمارەو راستیەکان, پرۆسەی پاکتاوکردنی رەگەزی روونو ئاشکراتر دەبێ، گەر سەرنجی ئاماری ساڵی 1957 بدەین, کە لەسەر دەستی حکومەتی عیراقی ئەو سەردەمە جێبەجێ کرا:

**ڕێژەی نەتەوەو کەمینەکان لەموسڵ, هەولێر, کەرکوک و دیالە :**

| لیوا | نەتـــــەوەو کەمینەکان | ڕێـــژەی٪ لـــە ئـامـــــــاری 1921 | ڕێژەی٪ لە ئـامـــــــاری 1947 | ڕێژەی٪ لە ئـامـــــــاری 1957 | ڕێـــژەی٪ لـــە ئـامـــــــاری 1977 | ڕێـــــــژەی زیادبوونی عـەرەب ( پاکتـاوکردنی ڕەگـەزی ) ڕێـژەی کـەم بوونـــــەوەی کـــورد و تورکمـــان و ئاشـــوری و جـــوو ( پاکتـــاوکردنی ڕەگەزی و ڕاگواستن ) لـە نێـوان سـاڵی 1957 و ساڵی 1977 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | عەرەب | ٪40.40 | | ٪56.1 | ٪73.7 | ٪17.4+ |
| | کورد | ٪36.53 | ٪35.4 | ٪30.7 | ٪24.8 | ٪5.8 - |
| | تورکمان | ٪3.29 | | ٪4.8 | ٪0.8 | ٪4 - |
| | ئاسووری | ٪18.54 | | ٪8.4 | ٪0.6 | ٪7.8 - |
| | جوو | ٪1.2 | | | | |
| هەولێر | عەرەب | ٪6 | | ٪6.6 | ٪10.4 | ٪3.8 + |
| | کورد | ٪88.9 | ٪91.3 | ٪89 | ٪86 | ٪3 - |
| | تورکمان | ٪1.44 | | ٪2.5 | ٪1.6 | ٪9 - |
| | ئاسووری | ٪2 | | ٪2 | ٪2 | |
| | جوو | ٪1.43 | | | | |
| کەرکوک | عەرەب | ٪31.9 | | ٪28.19 | ٪44.4 | ٪16.21 + |
| | کورد | ٪42.54 | ٪53 | ٪48.24 | ٪37.6 | ٪10.64 - |
| | تورکمان | ٪23.37 | | ٪21.44 | ٪16.3 | ٪5.14- |
| | ئاسووری | ٪2.14 | | ٪2.1 | ٪1.7 | ٪0.4 |
| دیالە | عەرەب | | ٪70 | ٪79.26 | ٪87.5 | ٪8.24 + |
| | کورد | | ٪26.6 | ٪18.21 | ٪16.3 | ٪1.91 - |
| | تورکمان | | ٪3.4 | ٪2.2 | ٪1.4 | ٪0.8 - |
| | ئاسووری | | | ٪0.3 | ٪0.4 | ٪ 0.1 + |

**لەخشتەکانی پێشوو ئەم ڕاستیانەمان دەست دەکەوێ :**

1- زیادبوونی دانیشتوانی عەرەب لەشارەکانی کوردستان (موسڵ, هەولێر, کەرکوک, دیالی) بەڕێژەیەکی زۆرو بەم شێوەیە :

**لەموسڵ :**

عەرەب پێش ئیسلام لەموسڵ نەبوون, دوای هاتنی ئیسلام ژمارەیان زیادی کرد لەساڵی 1922 ڕێژەیان (40.40٪) ی دانیشتوان بوو, لەساڵی 1947 ئەو ڕێژەیە زیادی کردوە, لەساڵی 1957 زیاتر بووە, بووە بە 56.1٪ دانیشتوان, لەساڵی 1977 زیادی کردووەو گەیشتوەتە 73.7٪ی دانیشتوان .

**لەهەولێر:**

عەرەب پێش ئیسلام لەم ناوچەیە نەبوون, لەئامارەکانی ساڵەکانی( 1921 , 1922, 1924) رێژەی دانیشتوانی عەرەب بوو بە 6٪ لەسنوری هەولێر، لەساڵی 1957 بووە بە 6.6٪ , لەئاماری ساڵی 1977 بووە بە 10.4٪ .

**لەکەرکوك:**

پێش ئیسلام لەم ناوچەیە عەرەب نەبووە... لەئاماری ساڵەکانی (1921, 1922, 1924)، بە 31.9٪ دانیشتوانی ناوچەکە مەزەندە کراون. (کە بە رای من ئەم رێژەیە یەکجار زۆرە, بەهیچ جۆرێك لەگەڵ کۆچ کردنی عەرەب بەبەردەوامی بۆ ئەم ناوچەیەو ئاماری ساڵی (1957), یەکتر ناگرێتەوە, کە لەئاماری 1957 سەرژمێرکراون بە 28.19٪, لەئاماری ساڵی 1977 بوون بە 44.4٪ دانیشتوانی ناوچەکە.

**لەدیالە**

عەرەب دوای بڵاوبونەوەی ئیسلام هاتونەتە ئەم ناوچەیە بەچەندین ساڵ ... بەهۆی بارودۆخی سیاسیو ئابوریو دینیو مەزهەبی, بەرێژەیەکی یەکجار زۆر گەشەیان کردو زیاد بوون, لەئاماری ساڵی (1947) مەزەندە کراون بەنزیکی 70٪ دانیشتوان, لەئاماری ساڵی 1957 زیادیان کردوەو بوون بە (79.26٪) و لەئاماری ساڵی 1977 زیادیان کردوە بۆ (87.5٪) دانیشتوانی ناوچەکە.

2- کەمبوونەوەی دانیشتوانی کورد لەشارەکانی کوردستان (موسڵ, هەولێر, کەرکوك, دیالە) , بەرێژەیەکی بەرچاو و بەم شێوەیە:

**لەموسڵ:**

دانیشتوانی شاری موسڵو ناوچەکە بریتی بوو لە (جولەکە, ئەنصار و زەردەشتیەکان) پێش هاتنی ئیسلام. کورد لەناو هەموو ئاین مەزهەبەکان هەبون, بەتایبەتی لەناو زەردەشتیەکان, بۆیە کورد یەکێکە لەنەتەوە هەرە کۆنەکانی ئەم ناوچەیە, باری سیاسیو شەڕ و ململانێ لەنێوان دەوڵەتانی رۆژئاواو رۆژهەڵاتو ناوچەکە، پێکهاتەی نەتەوەییو ئاینی ناوچەکەی گۆری. کوردیش وەك نەتەوەیەك بەر شاڵاوی ئەم ئاڵوگۆرە کەوت, بەهۆیەوە تووشی داشکانی زۆر هات.. لەبەرئەوە رێژەی کورد لەناوچەی موسڵ زۆر کەم بۆتەوە. لەئاماری ساڵەکانی (1924,1922,1921) رێژەی کورد لەلیوای موسڵ (36.53٪) بووە , لەساڵی 1947 بۆتە (35.4٪) لەساڵی 1957 کەم بۆتەوە بۆ رێژەی(30.7٪), لەئاماری ساڵی 1977 بۆتە (24.9٪).

**لەهەولێر:**

لەسەردەمە زۆر کۆنەکانەوە, کورد لەم ناوچەیە بووە لەئامارەکانی ساڵی (1921, 1924,1922) رێژەی کورد (88.9٪) بووە, لە ساڵی 1948 بۆتە (91.3٪) , لەساڵی 1957 کەم بۆتەوە بۆ 89٪, لەساڵی 1977 رێژەیان کەمتر بۆتەوەو بووە بە (86٪).

**لەکەرکوك:**

کورد یەکێکە لەنەتەوە هەرە کۆنەکانی ئەم ناوچەیە، لەبەر گرنگی ناوچەکە لەرووی کشتوکاڵیەوەو دەوڵەمەندی بەچەندین سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی, وەك زێی بچوك و سیروانو ئاوەسپیو باسەرەو خاسە, دواتر لەبەر دەوڵەمەندی ناوچەکە بەنەوتو کانزاکانی تر, ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە گرنگی خۆی هەبێو ببێ بەجێگای تەماحی داگیر کەران... لەبەر ئەوە هەمیشە شوێنی شەڕو ململانێ بووەو جێگیربوون لەم ناوچەیە زەحمەت بووە, کورد لەئاماری ساڵەکانی (1921, 1922 1924) لەسنوری کەرکوك (42٪) بووە,(کە پێشتر من رای خۆم وتوە لەسەر ئاماری نێوان ساڵی (1921, 1957).

لەئاماری ساڵی 1947 رێژەی کورد (53٪) بووە, لەساڵی 1957 کەم بۆتەوە بۆ (48.24٪), لەساڵی 1977 کەمتر بۆتەوە بۆ (37.6٪).

**لەدیالە:**

لەدێر زەمانەوە کورد لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون. بەڵام باری سیاسیو ئابوریو ئاینیو مەزهەبی وەك پێشتر باسمان کرد, ئاڵوگۆڕی خێراتر بەسەر ئەم ناوچەیەدا هێنا, کە ئەنجامی زۆر خراپ بوو بەسەر بوونو نەبوونی کورد لەم ناوچەیە. ئاماری ساڵی 1947 سەرژمێری کوردی کردووە بە (26.6%) .

3- لە جیاوازی نێوان رێژەی% کە جێگیر کراوە لەئامارەکانی (1921, 1947, 1957, 1977) تایبەت بەرێژەی نەتەوەکان (عەرەب, کورد, تورکمان, جوو, ئاسوری) لەسنوری هەر لیوایەك (موسڵ, هەولێر, کەرکوك, دیالە) ئەم چەند راستیەمان بۆ دەردەکەوێت:

أ- راستە دەبێ لەنێوان هەر دوو ئامارکردنێك, زیاد بوونێك هەبێ, لەچوارچێوەی بارە سروشتیەکەدا, بەڵام ئەو جیاوازیەی هەیە لەنێوان دوو ئاماردا یەکجار زۆرە, بۆ نموونە: جیاوازی نێوان ئاماری رێژەی عەرەب لەلیوای موسڵ لەساڵی 1921, لەگەڵ ئاماری رێژەی عەرەب لەساڵی 1977 لەلیوای موسڵ (لە ماوەی 56 ساڵدا) دەگاتە (33.3%) (73.7% - 40.4% = 33.3%)... ، کە ئەم زیادبوونە حاڵەتێکی نا سروشتییە, یان جیاوازی نێوان ئاماری ساڵی 1957 (56.1%)و ئاماری ساڵی 1977 (73.7%) , کە ماوەی (20) ساڵە, دەگاتە (17.6%) (73.6% - 56.1% = 17.6%) کە ئەم زیاد بوونەش زۆر ناسروشتییە.

ب- گەر ئەم حاڵەتە سروشتییە, بۆ رێژەی %ی نەتەوەکان (کورد, تورکمان, ئاسوری, جوو) زۆر لەکەمبوندان؟ هەندێکیان تا رادەیەك کۆتایی پێ هاتو نەمان وەك جوو! . بۆ نموونە: کەم بوونی کورد لەنێوان ئاماری ساڵی 1957و ساڵی 1977 لەکەرکوك بەرێژەی (10.64%) بوە کە ئەمە داشکانێکی یەکجار زۆرە... هەروەها کەم بوونی کورد لەئاماری ساڵی 1957 لەموسڵ (کە رێژەیان 30.7% بوو) بۆ رێژەی 24.9% لەساڵی 1977, کە جیاوازیەکە دەگاتە (5.8%) (رێژەی کەم بوون).

هەروەها کەم بوونی رێژەی تورکمان لەنێوان ئەو دوو ئامارە, لەکەرکوك بەرێژەی (5.14%) هەروەها کەم بوونی رێژەی ئاسوریەکان لەنێوان ساڵی 1921 (رێژەیان 18.54% بوو لە لیوای موسڵ) ئاماری ساڵی 1977 (کە رێژەیان کەم بووە بۆ 0.6%) کە دەکرێ بڵێین: هەموو ئاسوری لە ماوەی 56 ساڵدا بەعەرەب تۆمار کراون.

ج- دیارە زیادبوونی رێژەی عەرەب بەو رێژە زۆرە لەسنورەکانی موسڵ, هەولێر, کەرکوك, دیالە, لەسەر حیسابی کەمبونەوەی نەتەوەکانی تر بووە, لە کوردو تورکمانو ئاسوریو جوو, بەکورتی زیاد بوونی رێژەی عەرەب بەم جۆرە بووە:

1- کۆچ کردنی ژمارەی تازەی عەرەب بۆ کوردستان لەخوارو ناوەراستو سەردەمێکیش لەعەرەبستان (پاکتاوکردنی رەگەزی), کە ئەمە بەپرۆسەی پاکتاوکردنی رەگەزی دەناسرێت.

2- کۆچ پێکردنی بەزۆر, بەکوردو تورکمانو ئاشوریو جوو, ئەمیش کەم بوونەوەی رێژەیەکی ئەو نەتەوانە دەگەیەنێ کە ئەمیش بەپرۆسەی راگواستن لەموسڵو هەولێرو کەرکوكو دیالە لەقەڵەم دەدرێ.

3- کەم بوونەوەی کوردو تورکمانو ئاسوریو جوو, بەجۆرێکی تریش بووە, ئەویش ئەوەیە, رێژەیەکی ئەو نەتەوانە بەناوی عەرەب تۆمار کراون, دوای گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییان, ئەم حاڵەتە لەگەڵ هەموو نەتەوەکان کراوە بۆ نموونە: بەشێکی زۆری کوردی بەتاین یەزیدی بەناوی عەرەبەوە تۆمار کراوە, هەروەها تۆمار کردنی عەشیرەتەکانی ساڵەیی, بەرزنجی,... بە عەرەب. بەهەمان شێوەیە لەگەڵ ئاسوریو تورکمان. ئەم جۆرەش هەر بە (پاکتاوکردنی رەگەزی) یان پاکتاوی رەگەزی لە قەڵەم دەدرێ.

## قۆناغی پاکتاوکردنی رەگەزی پاش ساڵی 1957

قۆناغی پاکتاوکردنی رەگەزیو راگواستن دوای ساڵی 1957, تا ئەمرۆ جۆرو شێوەی جێبەجێکردنی گۆڕا. شێوازی پاکتاوکردنی رەگەزی پانتاییەکی گەورەترو فراوانتری بەخۆوە گرت. نیازو نییەتی داگیرکەر ئەوە بوو, باری نەتەوەییو نیشتمانی لەکوردستان هەمووی بگۆڕێ... بۆیە قوربانیانی ئەم قۆناغە یەکجار زۆر بووو هەتا ئەمرۆش درێژەی هەیە.. لەبەر کەمی بوارەکە, زۆر بەکورتی خاڵە گرنگەکانی پێشچاو دەخەین:

1- دەسەڵاتدارانی عێراق, بەنیازبوون کوردستانی عێراق قووت بدەن, چونکە جگە لەکەنەکردنیان لەناوچەکانی قوڵایی (موسڵ, کەرکوك, هەولێر, دیالی)و بەبەردەوامی, بەگەرمی خەریکی ئەوە بوون سنوری کوردستان لەرۆژهەڵاتو باکورەوە بەعەشایەری عەرەب بتەنن, لەسنوری رۆژهەڵاتەوە هەموو ناوچەکانی خانەقینیان داگیرکرد هەتا گەیشتنە ناوچەی بەمۆو زمناکۆ.. لەسنوری باکوریشەوە نزیکی شارۆچکەی زاخۆ بوونو لەناوچەی ئەتروش گەیشتنە شارۆچکەی ئەتروش.... کەنزیکترین خاڵی سەر سنورە.

2- دەسەڵاتداران لەعێراق, لەم قۆناغە زۆر بەتوندوتیژی کەوتنە جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیە, بەشێوەیەك کەسەدان هەزار کورد تێیدا فەوتان لەگرتنو کوشتنو پرۆسەی عەمەلیاتی ئەنفال (ئەنفالی بارزانیو فەیلییەکان) ئەنفالی ساڵی 1988. وێرانکردنی (4500) چوار هەزارو پێنج سەد گوند, بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەدژی کورد.

3- لەماوەی چل ساڵی رابردوو, بەپێی مەزەندەی دەزگاکانی حکومەتی هەرێمو مەزەندەی رێکخراوە ئینسانیەکان کەدەمێکە لەناوچەکەدان, زیاتر لە(700000) حەوت سەد هەزار کەسی کورد لەناوچەکانی موسڵو کەرکوكو هەولێرو دیالە, لەجێگەی باب‌وباپیرانیان دەرکرانو سەروەتو سامانیان داگیرکراوە, ئەمە جگە لەدەیان هەزار تورکمانو ئاشوری بەهەمان شێوە لەو ناوچانە دەرکراون.

4- بەهۆی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی دەسەڵاتدارانی عێراق, دەیان هەزار کوردو تورکمانو ئاسوری لەکوردستانی عێراقیان جێهێشتووەو پەراگەندی وڵاتانی دنیا بوون..

## رێژەی دانیشتوانی کورد لەهەموو عیراقدا

کەمبوونی رێژەی دانیشتوانی کورد لەهەموو شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستانو عیراق, بێگومان دەبێتە هۆی کەمبوونی رێژەی دانیشتوانی کورد لەهەموو عیراق. خشتەی رێژەی سەدی دانیشتوانی کورد لەگشت عیراق, لەنێوان (1947-1997) ئەو راستیەی سەرەوە زیاتر روون دەکاتەوە.

**خشتەی گشتی دانیشتوانی کورد**

**بەبەروارد لەگەڵ سەرجەم دانیشتوانی عیراق لەنێوان** 1947-1997

| | |
|---|---|
| 1947 | ٪30.4 |
| 1957 | ٪23.4 |
| 1970 | ٪22.9 |
| 1977 | ٪22.4 |
| 1987 | ٪22.2 |
| 1997 | ٪19.6 |

لەخشتەی سەرەوەدا, داشکانێکی بەرچاو بەدیدەکرێت لەرێژەی دانیشتوانی کورد لەعیراق. رێژەی کورد لەگشت عیراق, لەساڵی 1947, (30.34٪) دانیشتوانی گشت عیراق بووە, ئەنجامی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی بەرێگەی خۆش (اغراء)و ناخۆش (اکراە, ارهاب) زۆر داشکاوەو لەساڵی 1997 بۆتە 19.6٪ دانیشتوانی گشت عیراق.

حکومەتە رەگەزپەرستەکانی عیراق, لەماوەی (50) ساڵدا, توانیویانە رێژەی (10.4٪) لەگشتی دانیشتوانی کورد کەم بکەنەوەو دایشکێننو بخرێتە سەر گشتی رێژەی دانیشتوانی عەرەب لەعیراق. ئەمە جگە لەداشکاندنی رێژەی کەمینەکانیتری وەك تورکمانو ئاسوریو کلدانو ئەرمەنی.

## ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی کورد

ئەو ڕاستیانەی پێشتر باسیان لێوەکرا, سەبارەت بەکەمبوونی ڕێژەی کورد لەگشت عیراقدا, ئەوە دەگەیەنن, کەڕێژەیزیادبوونی ساڵانەی کورد لەگشت عیراق, ناسروشتییە.

**خشتەی ڕێژەی زیادبوونی ساڵانە لەعیراق و لەکوردستان ئەو ڕاستیە ڕوونتردەکاتەوە**

| ماوە ( ساڵ ) | ڕێژەیزیادبوونی ساڵانە لەعیراق(٪) | ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی کورد لەکوردستان و عیراق |
|---|---|---|
| 1957-1947 | ٪3.1 | 1.7 |
| 1970-1957 | ٪3.5 | 3.3 |
| 1977-1970 | ٪4.3 | 3.9 |
| 1987-1977 | ٪3.6 | 2.9 |
| 1997-1987 | ٪5.5 | 5.5 |
| 1997-1947 | ٪9.4 | 6.4 |

خشتەی سەرەوە ئەم چەند ڕاستیە دەگەیەنێ:

**یەکەم:** ڕێژەی زیادبوونی ساڵانە لەعیراقدا, تا ڕادەیەك لەگەشەکردنو زیادبووندا بووە.

دووەم: ڕێژەی زیادبوونی ساڵانە, لەکوردستانو لەناو کورددا, شتێك لەبەرزیو نزمی تێدایە, تا ڕادەیەك ناسروشتی دیارە.

ئەگەر ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی دانیشتوانی عیراق, لەگەڵ زیادبوونی ساڵانەی دانیشتوانی کوردستان بەراورد بکەین, تەنیا ئەوە دەگەیەنێ کەزیادبوونی ساڵانە لەگشت عیراقدا, لەسەر حیسابی کەمبوونی ڕێژەی کوردو کەمینەکانیترە.

## ڕێژەی دانیشتوانی کورد لەهەموو عیراق و بە پێی پارێزگاکانی کوردستان لەنێوان ساڵەکانی 1947-1977

دیارە ڕێژەی کورد لەهەموو عیراقداو بەپێی پارێزگاکانی کوردستان، گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووەو لەکەمبوونەوەیەکی بەردەوامدا بووە لەماوەی ئەو (30) ساڵەدا.

**خشتەی دانیشتوانی کورد لەهەموو عیراق**
**بە پێی پارێزگاکان لەنێوان (1947-1977)**
**ڕێژەی سەدی بەنسبەت هەموو دانیشتوان**

| پارێزگا | 1947 | 1957 | 1977 | ڕێژەی گۆڕانی ساڵانە ٪ |
|---|---|---|---|---|
| دهۆك | | 2.00 | 1.6 | 0.02 - |
| موسڵ | 4.4 | 2.4 | 1.2 | 0.06 - |
| هەولێر | 4.5 | 3.3 | 2.0 | 0.08 - |
| سلێمانی | 4.6 | 4.8 | 5.4 | 0.03 + |
| کەرکوك | 3.2 | 3.0 | 1.54 | 0.09 - |
| دیالە | 1.5 | 1.0 | 0.51 | 0.03 - |
| پارێزگاکانی | 0.5 | 0.3 | 1.7 | 0.04 + |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | تر |
| 17،0- | 13.95 | 16.7 | 18.7 | کۆی گشتی |

ئەم خشتەیەش ئەوە دەگەیەنێ کەرێژەیدانیشتوانی شارەکانی کوردستان (موسڵ, هەولێر, کەرکوك, دیالە) ,گۆڕانێکی زۆری بەسەرداهاتووە بەنسبەتی گشتی عیراقەوە... هەڵبەتە ئەم ئاڵوگۆڕەش لەوەوە هاتووە. کەدانیشتوانی کورد لەگۆڕاندا بووە. کورد لەساڵی 1947 لەلیوای موسڵ رێژەی 4.4٪ بووە لەگشت عیراق. بەڵام لەساڵی 1977 رێژەی کورد بووە بە(1.2٪) رێژەی گشتی عیراق... بەمشێوەیە رێژەی سەدی ساڵانە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە, بەجۆرێك, لەدهۆك, موسڵ, هەولێر, کەرکوك, دیالە, گەیشتووەتە خوار سفرەوە.

## دووەم: لەرووی سیاسیەوە

داگیرکەران دوورو نزیك هەمیشە نیازو نیەتپیسو گلاو بوونە لەگەڵ میللەت, بەبەدیهێنانی ئامانجە سیاسیو ئابوریو نەتەوەییو مەزهەبی...., بۆیە ئەم حاڵەتە لەبیروبۆچونی فیکریو سیاسیشیان رەنگیداوەتەوە. ئەوەتا حزبی بەعس, بەراشکاوی لەکۆنگرەی خۆی کورد بەمیوان دەزانێ لەسەر خاکی نیشتمانی عەرەبو ئەم راوبۆچوونە چووە ناو بەرنامەی سیاسییەوە, تارادەیەکیش کاری تێدا کراوەو بەشێکیشی جێبەجێکراوە.

فەرموون ئەمە بڕیاری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشە. (سەرۆك کۆماری عیراق), تایبەت بەجێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی لەکوردستان:

رقم القرار 529
تأريخ القرار 23 محرم 1410 ه
1989/8/24

استناداً الى احكام الفقرة (1) من المادة الثانية والأربعين من الدستور قرر مجلس قيادة الثورة مايلى:

1- يحق للعراقى من مسكنة منطقة الحكم الذاتى بتملك قطعة ارض سكنية فى مدينة بغداد والمحافظات الآخرى عدا محافظات (نينوى, التأميم, ديالى) بالأضافة الى ما يملكه من سكنى فى مسقط رأسه.

2- ينشر هذا القرار فى الجريدة الرسمية ولايعمل بأى نص يتعارض احكامه.

صدام حسين

رئيس مجلس قيادة الثورة

<u>*ئەمەش تەعدیلی بڕیارەکەیە*</u>

مجلس قيادة الثورة
رقم القرار:190
تأريخ القرار: 16/محرم/1413
1992/7/16م

<u>قـــــرار</u>

استناداً الى احكام الفقرة (1) من المادة الثانية والأربعين من الدستور :

قرر مجلس قيادة الثورة مايأتى :-

تلغى الفقرة (ثانيا) من قرار مجلس قيادة الثورة ذى الرقم (529) خمسمئة وتسعة وعشرين المؤرخ فى 1989/8/24 الرابع والعشرين من شهر أب عام الف وتسعمئة وتسع وثمانين, يحل محلها مايأتى :-

ثانيا: يحق للعراقى سكنة منطقة الحكم الذاتى تملك قطعة ارض سكنية فى محافظات القطر الأخرى (عدا محافظات نينوى ،التأميم ،ديالى) وفق الشروط المقررة لسكنة تلك المحافظات من العراقيين ويشمل بقرض المصرف العقارى وفق الأصول.

يتولى الوزراء المختصون والجهات ذات العلاقة تنفيذ هذا القرار.

*صدام حسين*

*رئيس مجلس قيادة الثورة*

بەڵگەی خوارەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کەحکومەتی عیراق، گەورەترین کەس‌و دەزگای حزبی‌و حکومی خۆی، بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە دیاریکردووە.

بسم الله الرحمن الرحيم

سري وشخصي

محافظة التأميم

شعبة المعلومات السكانية

العدد/ 589

التأريخ/ 12/ ربيع الثاني / 1418
1997/8/16

الى / مديرية التسجيل العقاري / التأميم

الموضوع/ تسجيل دور

استنادا لما جاء بكتاب لجنة الشمال - السكرتارية سري وشخصي- المرقم- 1319 في 1997/8/13 حصلت موافقة السيد نائب رئيس الجمهورية - رئيس لجنة الشمال-على تسجيل الدور المبينة أرقامها واسماء أصحابها المرحلين في القائمة المرفقة طيا ومؤشرا إزاء اسم كل مرحل اسم الشخص المستفيد وشمول تلك العقارات بنص القرار 42 لسنة 1986 لاتخاذ ما يلزم وأعلامنا إجراءاتكم بالسرعة.

المرفقات/ قائمة بالأسماء

*الفريق الأول الركن*

*أياد فتيح الراوي*

محافظ التأميم

**1997/8**

نسخة منه الى /

-لجنة الشمال - السكرتارية / كتابكم أعلاه... للتفضل بالاطلاع مع التقدير

-وزارة الداخلية / الداخلية العامة / م. س / كتابكم في 1997/6/24 للتفضل بالاطلاع مع التقدير

-قيادة فرع التأميم للحزب القائد/ للعلم وطيا قائمة بالأسماء مع التقدير

-مديرية الأمن التأميم/ للعلم وطيا قائمة بالاسماء رجاء

- مديرية الإسكان / كتابنا 376 في 15 /1997/5 لإلزام المستفيدين موضوعي البحث بالسكن في تلك الدور تنفيذا للتوجيهات ومتابعة ذلك وأعلامنا

- مديرية خزينة المحافظة

- مديرية المصرف العقاري / التأميم

- لجنة التقدير المركزية الاولى

- سكرتير لجنة تنظيم سكن المستفيدين

- سكرتير لجنة بيع دور المرحلين

- قسم حسابات المحافظة/كتابنا 477 في 1997/6/19 لاتخاذ ما يلزم حول صرف قيام الدور موضوعة البحث الى أصحابها وأعلامنا إجراءاتكم.

| ت | اسم المرحل | رقم الدار | اسم المستفيد المختصة له الدار |
|---|---|---|---|
| 1. | إبراهيم رحمن رضا | 134/114 دبس | عبدالكريم فرح عكس |
| 2. | عبدالله صالح رسول | 412/114 | سنيه جميل عبيد |
| 3. | كاكه شين محمد حسيب | 161/2 | حسين على حسن |
| 4. | محمد عزيز صالح | 141/2 | رزاق حسين فيصل |
| 5. | كريم مصطفى كريم | 120/2 | عباس فاضل عباس |
| 6. | عبدالرحمن سلام محمد | 13/20 | جاسم محمد حسن |
| 7. | نعمة كريم عبدالله | | سعاد صالح ابراهيم |
| 8. | مشير محمد ابراهيم | 82/2 | سري عبدالسلام عارف صالح |
| 9. | احمد حسين خضر | 24/114 دبس | قاسم ابراهيم حسن |
| 10. | محمود محمد قادر | 29/114 دبس | حلوة احمد صالح |
| 11. | محمود عبدالله رجب | 995 | سلام خلف زبون |
| 12. | عبد الجبار كريم قرني | 416 | ريسان حمدان شاوى |
| 13. | نجم الدين احمد عزيز | 50/6/26 | حسين عبد فلاني |
| 14. | محى الدين على محمد | 67/227/114 | على شرقي خلف |
| 15. | على محمد عمر | 50/241/14 | يوسف عبدالحميد علي |
| 16. | رحمن كاكل على | 50/221/14 | مهدي عبدالساد مكرم |
| 17. | محمد محىالدين فتاح | 53/127/4 | فروز مصطفى محمد |
| 18. | عثمان سليمان محمد | 53/10/1 | عماد محمد حمد حسن |
| 19. | احمد حسن حسين | | كريم حسن اسعد |
| 20. | محمد احمد حسن | 50/27/39 | حويز محمد رسن |
| 21. | محمد صالح قادر | 52/7/7 | كامل عبدالحسين حمادى |
| 22. | عثمان امين عبدالرحمن | 53/27/1 | فليح محمد حسن |
| 23. | نورالـــــدين عبــــدالله مصطفى | 4/100331 | حبيب لوقا حنا |
| 24. | حسين قادر محمد | 50/31 | حكيم رؤوف جاسم |
| 25. | كمال على عبدالله | 52/473 | عبدالصاحب جبار مظلوم |
| 26. | مجيد حميد احمد | 50/289 | فاضل قحطان نايف |
| 27. | نورى محمد محمود | 50/2869 | خليل ابراهيم حسين |
| 28. | امين احمد رضا | 48 بولاق | محمد حسون معين |
| 29. | شرف الدين مصطفى محمد | 52/840/7 | عماد كريم عبد الساده |

بسم الله الرحمن الرحيم

محافظة التأميم
شعبة المعلومات السكانية
العدد/ [illegible]
التاريخ / ١٧ / ربيع الثاني / [illegible]
١٩٩٧/٨/ [illegible]

سري وشخصي

الى / مديرية التسجيل العقاري / التأميم
الموضوع / تسجيل دور

[illegible] ١٩٩٧/٨/١٢ [illegible] على تسجيل الدور [illegible]
واسماء اصحابها المرحلين في القائمة المرفقة طيا [illegible] اسم كل مرحل اسم الشخص المستفيد
وشمول [illegible] ١٩٨٦ [illegible] واعلامنا اجراءاتكم بالسرعة .

المرفقات / قائمة بالاسماء

الفريق الاول الركن
[illegible]
محافظ التأميم
١٩٩٧/٨/

نسخة الى /
[illegible] مع التقدير
وزارة الداخلية / [illegible] مع التقدير
[illegible] التأميم [illegible] / للعلم وطيا [illegible] بالاسماء مع التقدير
مديرية امن التأميم / للعلم وطيا قائمة بالاسماء [illegible]
مكتب الاسكان / كتابنا ٣٢٦ في ٩٧/٥/١٥ [illegible] موضوع البحث بالسكن في تلك الدور
تنفيذا للتوصيات ومتابعة ذلك [illegible]

مديرية خزينة المحافظة
مديرية التسجيل العقاري / التأميم — للتأشير [illegible] وطيا قائمة بالاسماء
لجنة التقدير المركزية الاولى
سكرتير لجنة تنظيم سكن المستفيدين
سكرتير لجنة بيع دور المرحلين

[illegible]
البحث الى اصحابها [illegible] واعلامنا اجراءاتكم .

( ١-١ )
سري وشخصي

ئەمەو سەدان بەڵگەی لەجۆرە هەیە, کەدەرفەتەکە ئەوە نییە لەم گۆشە کەمەو لەچوارچێوەی ئەم باسەدا دابەزێ.

ئەگەر سەرنجی نەخشەی دنیا بدەین‌و بگەڕێینەوە بۆ مێژووی کۆنی ئادەمیزاد, دەبینین هەڵکشان‌و داکشانی زۆری گەلان‌و میللەتانی تێدا بووە, بەهۆی کارەساتی سروشتی (بومەلەرزە, لافاو, بڵاوبونەوەی نەخۆشی, قات‌وقڕی بەهۆی بێبارانی..)و, بەهۆی شەڕو ململانێ لەپێناوی پاکتاوکردن‌و دەسەڵات‌و خۆسەپاندن, ئەنجام ماڵ ویرانی زۆری لێکەوتۆتەوە لەسەرو ماڵ‌و ژیان, کە لەژماردن‌و مەزەندەکردن نایەت, شەڕو ململانێ بۆ داگیرکردن‌و تاڵانکردن‌و لەناوبردنی میللەتان, تۆوی ناکۆکی‌و شەڕو ململانێی جێهێشتووە, وانەو پەندەکانی ئەم شەڕو ململانێیە, دەست بەدەست, نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە... بۆیە کەم کێشەی شەڕو شۆڕ هەیە لەمێژووی ئادەمیزاددا بنبڕ کرا بێ‌و کۆتایی پێهاتبێ‌و شوێنەواری نەمابێ.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ, کەشەڕو ململانێ‌و

کوشتن‌و لەناودان‌و بێ‌سەرو شوێنکردن, شوێنەواری دەبێ لەسەر دەروونی ئادەمیزاد... ئەم شوێنەوارەش لەدەروونی, وەك فاکتەری بۆماوەیی (العامل الوراثي) لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوەو کاریگەری خۆی دەبێ...

نمونەش یەکجار زۆرن لەمێژووی کۆن‌و نوێدا, شەڕی نێوان رۆژهەلاّت‌و رۆژئاوا, لەماوەی پێش زاین, شەڕی نێوان رەشپێست‌وسپی پێستەکان‌و شەڕی نێوان رژێمی سەرمایەداری‌و سوشیالیستی...! کەئەمانە بەگشتی شەڕ بوون لەدژی مرۆڤو لەزۆر ناوچەی دنیا شەڕ بووە لەپێناوی پاکتاوکردنی ئەم نەتەوەو ئەو نەتەوەیە! فاکتەرە بەهێزەکانی ئەم شەڕو ململانێیە چی بوون؟

1- سیاسەتی داگیرکردن‌و دەسەلاّتی رژێمی دکتاتۆری بیری سیاسەتی داگیرکردنی ولاّتان‌و لەناودانی میللەتان‌و بەتالاّنبردنی سەروەت‌و سامانیان‌و چەوساندنەوەی مرۆڤ دەمێکە هەیە، مێژووی مرۆڤایاتی پڕە لەلاپەڕەی رەش لەم رووەوە. قوربانی ئەم عەقلّییەتە لەسەرو ماڵو ژیان, زۆر گەورەیە, لەژمارەکردن نایەت... میللەتی کوردیش بەهەزاران ساڵە دووچاری سیاسەتی داگیرکردن‌و لەناوبردن‌و تالاّن‌و زوڵم‌و ستەم هاتووە.. باجی ئەم داگیرکردنە, ئەوەیە, میللەتی کوردو ولاّتەکەی دابەشکرا بەسەر چەندین ولاّتدا, سەروەت‌و سامانەکەی بەتالاّن چوو, خۆشی لەهەموو مافە مرۆییەکانی بێبەش کرا, بەمافی زمان‌و قسەکردنیش. کورد لەهەموو کوردستاندا دووچاری شەڕی مان‌و نەمان هات کە گەورەترین‌و قورسترین‌و تازەترین چەك لەدژی کورد بەکار هات, بەچەکی کیمیاوی‌و بایۆلۆجیشەوە, کەبەپێی یاسای نێو دەوڵەتی قەدەغە کراوە, لەنزیکترین مێژوو, بەسەدان هەزاریان لێ بێ‌سەرو شوێنکردن‌و بەدڕندەترین شێوە لەناویانبردن تا ئەمڕۆش, ئەم سیاسەتە لەئارادایە لەدژی کورد, بەلاّم ئالّوگۆڕەکانی دە ساڵی رابردوو, لەدنیادا, لەهەڵتەکاندن‌و هەڵوەشانەوەو هەرەسهێنان‌و رووخانی, دەیان رژێمی دکتاتۆری لەدنیاداو, سەرکەوتنی بیری سیاسی تازە لەدیموکراسی‌و مافی مرۆڤو مافی چارەی خۆنوسین, ئومێد بەخشە بۆ مەسەلەی کورد, لەکوردستاندا.

2- فاکتەری گرنگیتر ئەوەیە, رژێمە دکتاتۆرەکان چی سەروەت‌و سامانیان هەیە بۆ داگیرکردن‌و شەڕو کوشتن‌و لەناودان‌و پاکتاوکردن‌و سەرکوتکردن بەکاری دێنن... ئەم فاکتەرەش وەك خۆی نەماوە لەدەستی داگیرکەر, ئابوری حکومەتی عیراق زۆر کزبووە, بەهۆی شەڕی دەیان ساڵەی لەگەڵ کوردو هەشت ساڵ شەڕی ئێران‌و شەڕی کەنداو... عیراق راستە ولاّتێکی دەوڵەمەندە لەرووی کانزایی‌و کشتوکاڵی‌و بازرگانیەوە, بەلاّم ئەو شەڕانەی باسکران, ئابوری عیراقییان لەبن هێنا, ئەنجام ئەمڕۆ عیراق قەرزو قۆڵەی زۆری ولاّتانی وەك روسیاو فەرەنساو هی تری لەسەرە, کە بەسەدان ملیار دۆلار مەند دەکرێت.

3- فاکتەری جەماوەری‌و رای گشتی رژێمە دکتاتۆرەکان بۆ پشتگیری بڕیاری سیاسی خۆیان, بەردەوام هەوڵیانداوە پشتگیری جەماوەریشی بۆ ئامادە بکەن بۆ ترساندن‌و تۆقاندن بەئاگرو ئاسن, حکومەتی عیراق هەمیشە دروشمی بریقەداری هەلّگرتووە بۆ چەواشەکردنی رای عەرەبی‌و عیراقی, بۆ ئەم مەبەستەش دەزگاکانی سیخوڕی (ئەمن, ئیستخبارات, مخابرات , دەزگاکانی حزبی)و دەزگاکانی راگەیاندن لەخزمەتی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە بوون.... لەبەرامبەر ئەمەش رژێمی عیراق نەیهێشتووە بەرامبەرەکەی (معارض) دەنگ‌و رەنگی بەهیچ جێگەیەکی ئەم دنیایە بگات, لەناوەوە هەرچی بۆ کراوە کردوویەتی بۆ پاکتاوکردنی کوردو سوتماك کردنی کوردستان. رژێمە دیکتاتۆریەکانی دنیاش وەك سۆڤیەت. رژێمە دیکتاتۆرەکانی ئەوروپای رۆژهەلاّت‌و تەنانەت زۆربەی ولاّتانی رۆژئاواش. کۆمەك‌و پشتگیری سیاسی‌و ئابوری حکومەتی عیراقیان کردووە. لەپێناوی ئامانج‌و بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان

ئەم فاکتەرەش زۆربەی نەماوە وەکو ئەوەی کەهەبوو، هەندێکی بێدەنگ بووە، هەندێکی کزبووەو بەشێکی چاکی هەڵوێستی پێچەوانە بۆتەوە.

4- فاکتەری ڕاگەیاندن :(گرنگیو رۆڵی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بۆ پشتگیری لەدیکتاتۆریەت).

حکومەتی عیراق گرنگی زۆری دابوو بەرۆڵی ڕاگەیاندن لەئاستی ناوخۆی عیراقو عەرەبو دنیا... گرنگیدان بەراگەیاندن, گەیشتە ئەوەی, لەسەردەمی شەڕی ئێرانو شەڕی جولانەوەی کورد, دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەعیراق, وەك فەیلەقێك ناوی ببرێو تەقدیر بکرێت.

ئامانجی ڕاگەیاندن بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی حکومەتی عیراق بوو لەلایەك‌و, لەلایەکی ترەوە کۆمەڵی نێودەوڵەتیو جیهانی عەرەبی ئیسلامی پێ چەواشە بکات, بەڵام هەڵکردنی باهۆزی دیموکراسیو مافی مرۆڤو, بوژاندنەوە هەستی نەتەوایەتیو مافی چارەی خۆنووسین, هەموو ئەو تەمومژەی رەواندەوە, کەبەدەیان ساڵ رژێمی دکتاتۆری دروستی کردبوو... ڕاستیەکان بۆ گەلانی دنیا ئاشکرا بوون کەمیللەتی کورد چی بەسەرهاتووە لەسایەی رژێمی دەسەڵاتدار لەعیراق. تەنانەت بارەکە بەشێوەیەك وەرچەرخایەوەو هەڵگەڕایەوە, بەهۆی رۆڵی گرنگی میدیاکان رژێمە دکتاتۆرەکانی دونیا ریسواو نابووت, سوك‌و چروك بوون.. لەکوردستانی عیراقیش, بەهۆی رۆڵی ڕاگەیاندنو لەرێگەی ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە, ڕاستیەکانی شەڕی نێوان عیراقو جولانەوەی کوردو عیراقو ئێران بۆ دونیا ئاشکرا بوو, کەرژێمی عیراق چەکی کیمیاوی بایۆلۆژی لەدژی میللەتی کورد بەکارهێناوە, لەچەندین شوێنی وەك هەڵەبجە, گۆپتەپە, عەسکەر, دۆڵی جافەتی, شاناخسێ, قەرەداغ, شێخ وەسانان, بادینان,.... ئەگەرچی هیچ کاردانەوەیەکی وا نەبوو لەو سەردەمەدا, بەهۆی بوونی دوو جەمسەری (ئەمریکا, سۆڤیەت) لەمەش چاکتر بۆ میللەتی کورد ئەوەبوو لەراپەرینی ساڵی 1991, چۆن میدیاکان رۆڵی خۆیان گێڕا, بۆ ئاشکراکردنو نیشاندانی کارەساتی کۆچی ملیۆنی کورد بۆ مەرزەکانی ئێرانو تورکیا... ئەمە کاتێك بوو, تازە شەڕی کەنداو کۆتایی هاتبوو بەسەرکەوتوویی لەدژی حکومەتی عیراق جەمسەری رۆژهەڵاتیش لەگەرمەی لێکترازانو هەڵوەشاندنەوە بوو. گرنگی میدیا ئەوە بوو, هەم ڕاستی رژێمی عیراقی بەدنیا ناساندو هاوسۆزێك دروست بوو لەنێوان میللەتانی دنیاو کورد, کەدواتر ئەو هاوسۆزییە بوو بەبڕیارێکی نێودەوڵەتی بۆ پاراستنی میللەتی کورد لەهێرشو پەلاماری حکومەتی عیراق. بەوشێوەیە گرنگی رۆڵی تەکنەلۆجیای پەیوەندیو ڕاگەیاندن گۆڕا, بۆبەرژەوەندی میللەتی کورد.

5- ڕێکخراوی پیشەییو بەناو دیموکراسیو جەماوەریو ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکان, لەئاستی ناوەوەو دەرەوەی عیراق, هەمووی بەگشتی سەرچاوەی پڕوپاگەندە بوون بۆ حکومەتی عیراق بەتایبەتی ڕێکخراوەکانی ناوخۆی عیراقو جیهانی عەرەبیو ئیسلامی- بەجامعەی عەرەبیو کۆنگرەی ئیسلامیشەوە, بەڵام کاتێ بارەکە وەرچەرخاو, ڕاستی حکومەتی عیراق بۆ هەمووان ئاشکرا بوو, ژمارەیەکی چاك لەرێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی دونیا بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان بەمافی مرۆڤو کاری خزمەتگوزاریەوە هەیە, رۆڵی بەرچاویان هەبوو, لەلابردنی پەردە لەرووی حکومەتی عیراقو ئاشکراکردنی ئەو زوڵمو ستەمەی بەسەر میللەتی کوردا هاتووە. ئەم وەرەقەیە کە تا دوێنێ بەشێکی لەژێر کاریگەری حکومەتی عیراق بوو, ئەمڕۆ گەر لەگەڵ میللەتی کورد هاوسۆز نەبێ, لەدژی نییە.

6- گرنگی رۆڵی پێکهاتەی نەتەوەییو ئاینیو مەزهەبیو باری دیموگرافی دانیشتوان لەجێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی لەکوردستان.

عیراق ولاتێکی فره نەتەوەییە, هەروەها فره ئاینیو مەزهەبیشە... پێکهاتووە, لەنەتەوەکانی عەرەب, بەرێژەی(70٪) و کورد زیاتر لە20٪ ی دانیشتوانو تورکمان بەزیاتر لە2٪ی دانیشتوانو کەمینە (ئاسوری، کلدانیو ئەرمەنی...) بەئاین مەسیحی زیاتر لە3٪ی دانیشتوان - لەرووی ئاینییەوە. زیاتر 95٪ دانیشتوانی عیراق موسوڵمانن, بەشەکەی تریش مەسیحیو یەزیدییە. لەرووی مەزهەبیشەوە زۆربەی موسوڵمانانی عیراق شیعە مەزهەبن, کەرێژەیان بەپێی مەزەندە زیاترە لە50٪ ی دانیشتوانی گشتی عیراق, کەباس لەشیعە دەکرێت لەعیراق, شیعەی عەرەبو کوردو تورکمان دەگرێتەوە, هەریەکەیان بەپێی رێژەی خۆی.

رێژەی عەرەب لەعیراقدا (70٪) تێناپەرێت, زیاتر لە50٪ شیعەیە, رێژەی عەرەبی سونە بەمەزەندە 18٪ی دانیشتوانی گشتی عیراقە.

لەسەردەمی کۆنو ئەمڕۆشدا وەك ئاشکرایە بۆ هەموان, زۆربەی ئەوانەی بەشداریان لەجێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی کردووەو وەك ئامێرێك بەدەستی دەسەڵاتدارانەوە بوون، زیاتر عەرەبی سونە بووە, بۆ دڵنیایی زیاتر سەرنجی دانیشتوانی عەرەبی ناوچەی موسڵو هەولێرو کەرکوك بەگشتیو بەشێکی سنوری دیالە بدەن, کەعەرەبی سونەیە.. دیارە ئاینو مەزهەب رێگربوون, یان بەکەمی لەگەڵ ئەوە نەبوون, کەدەسەڵاتێك یان نەتەوەیەك, خاكو نیشتمانی نەتەوەیەکیتر داگیربکاتو خەڵکەکەش لەناوببات, یان ئاوارەو دەربەدەری بکات.... لەمێژوویەکی نزیکدا زانای گەورەی شیعە, خوالێخۆشبوو ئیمام سەید موحسین حەکیم, فەتوای دا تەنانەت شەڕی دژی جولانەوەی کوردیشی بەحەرام زانی.

حکومەتی عیراق, بەهاتنی بۆ سەر دەسەڵات, نیازو نییەتی ئەوە بوو، کەئەو بەرنامەیە (پاکتاوکردنی رەگەزیی) بەعەرەبی شیعە جێبەجێبکات, بۆئەوەی هەم لەبەغداو خوارووی عیراق رێژەیان کەم بکاتەوەو لاوازیان بکات, هەم شەڕی میللەتی کوردیان پێبکات, ئەنجام بەرنامەکەی وەك خۆی جێبەجێنەکرا.. چونکە هەر لەکۆتایی شەستەکانەوە, حکومەتی عیراق ژمارەیەکی زۆر لەشیعەکانی خوارووی عیراقی هێنا بۆ کوردستان, لەناوچەکانی هەولێرو کەرکوك نیشتەجێی کردن, بەڵام ئەوەبوو بەشێکی ئەو خێزانانە گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان لەخوارووی عیراق . دواتر حکومەتی عیراقی سڵی لەوە کردەوە, کەشیعەو جولانەوەی کورد رێکەوتن بکەن لەدژی حکومەتی عیراق ... بۆیە دواجار کەوتە هێنانی عەرەبی سونە لەموسڵو تکریتو روومادیو فەلوجەو شوێنەکانی تر. لەلایەکی تر کە لەرووی مەنتقی (منطق)و حیسابییەوە مەزەندەو بەراوردی دەکەین, ئەم راستیانەمان بۆ دەردەکەوێ:

یەکەم: دەسەڵاتداری عەرەب لەعیراق بەو رێژەیەی کەهەیەتی ناتوانێ (1/4) ی دانیشتوانی هەموو عیراق, کەکوردە, لەناو بداتو پاکتاوی بکات جگە لەمەش هەر کورد ئامانج نییە بۆ پاکتاوکردن بەڵکو تورکمانو ئاشوریو کلدانیو ئەرمەنیش هەر لەهەمان بەرنامەدان, بۆیە لەرووی مەنتیقی حیسابییەوە نابێ ئەو پرۆژەیە سەربگرێ.

دووەم: بەو حاڵەتەی کەئەمڕۆ هەیە لەعیراق.... کەسونە کەرەستەی بنچینەییەو هێزی سەرەکییە لەدەستی حکومەتی عیراق, ئایا دەکرێت لە(18٪) دانیشتوانی عیراق زیاتر لە(25٪) پاکتاو بکرێت؟!

سێیەم: راستیتر ئەوەیە, حکومەتی عیراق چەند ئامانجییەتی کورد پاکتاو بکات ئەوەندەش ئامانجییەتی شیعە پاکتاو بکات وەك مەزهەب... بۆیە ئەمیان هەر زۆر نامەنتقییو (مەحاڵە)!

7- گرنگی هەستی بوونو هەستی نەتەوایەتیو نیشتمانی...

دیکتاتۆرەکان لەهەر جێگەیەکی ئەم زەمینە بووبن, مافی ئەوەیان نەداوە بەهیچ کەسو گروپو حزبو ڕێکخراو... کەهەست بەبوونی خۆی بکاتو, هەستی نەتەوایەتیو نیشتمانیو مرۆڤدۆستی هەبێو شانازیان پێبکات... ئەوانەی تەنیا بۆ خۆی بەرەوا زانیوە, گەر لایەکیتر ئەمەی بەمافی رەوای زانیبێ, خۆی توشی لەناودانو پاکتاوکردنە کردووە.

کوردستانو کورد, لەسایەی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی حکومەتەکانی عیراق، لەماوەی (80) ساڵی رابردوو, تووشی کارەساتو ماڵوێرانی زۆر بووە, ولاتی داگیر کراو سەروەتو سامانی دەستی بەسەردا گیرا, خۆشی تووشی گرتنو کوشتنو لەناودان بوو... هەتا کار گەیشتە ئەوەی ناسنامەی نەتەوەیی بگۆڕنو بەزۆرو بەبێ ئاگاداری خۆی بیکەن بەعەرەب, لەئامارکردنی ساڵی 1977, (99.6%) کوردی یەزیدی ناوچەی موسڵیان بەعەرەب تۆمارکرد, هەموو مەسیحییەکانی (کلدان, ئاسوری, ئەرمەن) سنوری موسڵیان بەعەرەب تۆمارکرد, وەك نمونەیەك.

گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەییو نیشتمانی, زەوتکردنی ئیرادەی مرۆڤە, هەوڵدانە بۆ کۆنترۆڵکردنی هەستی مرۆڤ, کەئەنجامەکەی بێڕێزییە بەکەسایەتی مرۆڤ, بەلام دیکتاتۆرەکان لەمەیان بەسەهوودا چوون, چونکە رەنگە رژێمە دیکتاتۆرەکان بتوانن ولات داگیربکەن, بکوژن, ولات بەدەر بکەن, سەروەتو سامان تالان بکەن, ناوو ناسنامە بگۆڕن, بەلام قەت ناتوانن هەستی بوونو هەستی نەتەوەییو نیشتمانی بکوژنو کۆنترۆڵی بکەن لەمرۆڤ. هەستی مرۆڤ داگیر ناکرێتو کۆنترۆڵ ناکرێت. هەروەها هۆشو بیری مرۆڤیش داگیرکردن ئاسان نییە, بۆیە دوور نییە, ئەم فاکتەرە, کاردانەوەی توندی هەبێ لەدژی داگیرکەر.

8- نزیکترین تاقیکردنەوە: تاقیکردنەوەیەکی نزیکمان هەیە, ئەویش راپەرینی خەڵکی کوردستانە لەئازارو نیسانی ساڵی 1991, عەرەبی تەعریب لەهیچ جێگەیەکی کوردستان خۆیان پێنەگیرا چ لەترسا, چ لەبەر ئەوەی ناوچەکەیان بەهی خۆیان نەدەزانی, بۆیە ئامادە نەبوون بەرگری لێبکەن لەبەر ئەوە لەبەشێکی ناوچەی خانەقینو کەرکوکو قەرە هەنجیرو ناوچەی دهۆکو زاخۆو ئەتروش خۆیان بۆ نەگیراو ناوچەکەیان جێهێشت.

**بۆ ئەم بابەتە سوود**

**لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**


1- دەلیلی سەرژمێری ساڵی 1957

2- دەلیلی سەرژمێری ساڵی 1947

3- کێشەی موسڵ/ فاضل حسین

4- عباس العزاوي/ تأريخ اليزيدية في العراق (1935).

5- الفتوحات الأسلامية تأليف المرحوم السيد (احمد بن زيني دحلان).

6- موجز تأريخ البلدان العراقية (عبدالرزاق الحسني).
7- مدن كردية قديمة تأريخها, جغرافيتها, رجالها, علمائها (محمد جميل روذبياني).
8- كردستان في القرن الثامن الهجري/ دراسة في تأريخها السياسي والأقتصادي د. زرار صديق توفيق.
9- اقليم كردستان العراق.
10- الجمهورية العراقية, وزارة التخطيط, الجهاز المركزي للأحصاء, نتائج التعداد العام للسكان لسنة 1977.
11- تأريخ الموصل جزء الأول/ القس سليمان الصائغ.
12- الموصل في القرن الثامن عشر/ حسب مذكرات دومنيكو عربها القس روفائيل بيداويد.
13- الجمهورية العراقية, وزارة التخطيط, الجهاز المركزي للأحصاء , مديرية الأحصاء السكاني, نتائج التعداد لسنة 1987, لمحافظة اربيل, دهوك, ديالى, سليمانية, صلاح الدين كركوك, نينوى, واسط, مطبعة الجهاز المركزي للأحصاء_ بغداد, 1988.
14- الجمهورية العراقية, وزارة التخطيط, الجهاز المركزي للأحصاء, مديرية الأحصاء السكاني, نتائج التعداد لسنة 1977, لمحافظة اربيل, دهوك, ديالى, السليمانية, صلاح الدين, كركوك, نينوى, واسط, مطبعة الجهاز المركزي للأحصاء_ بغداد, 1978.
15-كەركوك -وريا جاف- دراسه سياسيه اجتماعيه.
16-چوارساڵ كارو خزمەتو ئاشكراكردن_ پارێزگای كەركوك.
17-گۆڤاری كەركوك ژمارە: 8،5،3،2.
18-منطقة كركوك ومحاولات تغير واقعها القومي -د. نوري طالباني.

# پاکتاوکردنی کوردو
# تەعریبکردنی کوردستان لەمێژووی کۆن دا

جەلال جەوهەر عەزیز

**سەرەتا دەمەوێ ئەوە بە خوێنەر رابگەیەنم کاتێ سەرقاڵی ئامادەکردنی بەشێ سێیەمی ( 80 ساڵ تەعریبکردنی کوردستان ) بووم، کە تایبەت بوو بە لیوای موسڵ ژمارەیەك سەرچاوەی کۆنم دەستکەوت کە شتی زۆر گرنگیان تێدا بوو، باس لە پاکتاوکردنی کورد لەمێژووی کۆندا دەکەن. بۆیە بە پێویستم زانی بگەرێمەوە سەر ئەومێژووە کۆن و گرنگە، ئەگەر بە کورتیش بێت، شتێکی لێوە باس بکەین کە لە راستیدا دەبوو بەشی یەکەمی بابەتی ( 80 ساڵ تەعریبکردنی کوردستان ) بوایە.**

__لیوای موسڵ__

***لیوای موسڵ*** : شاری موسڵو ناوچەکانی، سەردەمو دەسەڵاتی جۆراوجۆری بەخۆیەوە بینیوە وەك سەردەمی ئاشوری، کلدانی، فارس، رومانی، ئیسلامی بەهەموو سەردەمو قۆناغەکانی تا داگیرکردنی لەلایەن بەریتانیاوەو لکاندنی بەعیراق. لەهەر سەردەمێکدا، ناوی خۆی هەبووە، لە سەردەمی ئارامیەکان ناوی قەڵای رۆژئاوا (حصن عبورایا) بووە، بۆ جیاکردنەوەی لە قەڵای رۆژهەڵات کە نەینەوا بووە[1] . لەسەردەمی دەسەڵاتی فارسو کاتی حوکمڕانی ئەردەشێر، ناوی گۆڕا بۆ نو ئەردەشێر[2]، واتە ئەردەشێری تازە. لەسەردەمی هێرشی ئیسلام بۆ ناوچەکەو دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکە لەلایەن ئەوانەوە، ناوی شارەکە تەعریبکراو ناوی بوو بە موسڵ، موسڵ (الموصل) عەرەبیە، واتای شوێن دەگەیەنێ، ئەو شوێنەی دوو ناوچە یان دوو شوێنی تر بەیەکەوە دەبەستێتەوە[3].

شاری موسڵ قەڵای هەبووەو شورەشی هەبووە. لەسەردەمی ئەتابەکیەکان شورەی موسڵ نۆ دەرگای هەبووە، بەم ناوانە: دەرگای یەکەم(عمادی) ئامیدی دەرگای شەنگار، دەرگای کندە، دەرگای جصاصە، دەرگای عیراق ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ، کە موسڵ بەشێك نەبوو لەعیراقی ئەو سەردەمە - دەرگاکە بە رووکاری عیراقدا بووە، دەرگای قصابەکان، دەرگای جسر، دەرگای مەشرەعە[4].

سنوری جوگرافی موسڵ، بە پێی ئەو وەزعە سیاسیە، سەربازیە کە هەیبووە، هەرگیز جێگیر نەبووە، بەڵکو بەردەوام لە گۆڕاندا بووە، هەندێ سەردەم سنوری لیوای موسڵ فراوان بووە هەندی جاریش بچوك بووە. بەڵام شاری موسڵ هەموو جار شوێنی هەرە بنچینەیی هەبووە لە هاوکێشەی ناوچەکەدا. لەبەر گرنگی ئابوریو بازرگانی بە تایبەتی سەربازی، بۆیە داگیرکەران زۆر بەگرنگ گرتوویانە، لەبەر ئەوە، هەر کە شاری موسڵیان داگیرکردوە، بەگەرمی کەوتونەتە سەنگەرلێدان بۆ مەبەستی بەرگریو دروست کردنی قەڵاو شورا. سنوری موسڵ زۆربەی کات بریتی بووە، لەمەرکەزی موسڵ، ناوچەکانی زاخۆ، ئامیدی، شێخان، دهۆك، ئاکرێ، تەلەعفەر، شەنگار، شەرگات، بادۆشو گەیارە.

__دانیشتوانی موسڵ__

پێکهاتەی موسڵ وەك سنوری جوگرافیو رووبەرەکەی، هەمیشە لە گۆڕاندا بووە، رێژەی ژمارەی دانیشتوان وەکو نەتەوەکان، لە گۆڕاندا بووە، بەهۆی کارەساتی شەڕو ململانێو نەبوونیو بڵاوبونەوەی نەخۆشیو نائارامی سیاسیو شەڕ لە ناوچەکە وای کردووە باری دیموگرافی ناوچەکە بەردەوام لەگۆڕاندا بێت. زیاتر ناوی ئەو نەتەوانەش دیارە کە ناوچەکەیان داگیر کردووە، وەك فارس، تورك، عەرەبو رۆم. پێکهاتەی

نەتەوەیی‌و ئاینی‌و مەزهەبی موسڵ‌و ناوچەکانی بەپێی کۆنی لەئاسووری‌و ئەرمەنی، کورد، فارس، تورك، عەرەب‌و ئاینەکانیان زەردەشتی، یەهودی، مەسیحی(بەهەموو مەزهەبەکانیانەوە) و ئیسلام بە هەموو مەزهەبەکانیانەوە پێکهاتووە.

موسڵ لە چارەکی یەکەمی سەدەی یەکی زایینی‌دا، دانیشتوانی بەگشتی کورد بوون، وەك لە کتێبی (بلدان خلافە الشرقیە-لوسترنج)[5] هاتووە، هەروەها ناوچەکانی باکورو رۆژهەڵاتو رۆژهەڵاتی خواروو باکوری رۆژئاوای بەگشتی کورد بوون.... بەڵام نەتەوەکانی تریشی بۆ هاتووە، بۆ مەبەستی داگیرکردن‌و تالان کردن، هیچ جۆرە بەڵگەیەکی مێژوویی سەلمێنراو نیە، لەمێژووی کۆن کە عەرەب خاوەنداریێتی لەناوچەی ئاشووریەکان هەبووبێ[6] . دۆمینیکۆلانزا کە یەکێکی ئیتالی بووە لەسەدەی هەژدەهەم سەردانی ناوچەکەی کردووەو بەم شێوەیە یاداشتی خۆی لەسەر شاری موسڵ دەنووسی، کە قەشە روفائیل کردویەتی بەعەرەبی‌و ئەڵێ، (ژمارە هەرچەند بێ، زۆربەی خەڵکی موسڵ، ئاستی رۆشنبیری‌یان کەمە، چونکە زۆربەیان لەتورك‌و کورد پێکهاتوون.

**کەش‌و هەوای موسڵ‌و ناوچەکە:**

بە هۆی سروشتی زەوی‌و هەوا، لەبەر بەرزایی زۆرو نزمی ناوچەکە لەئاستی دەریا، لەشاخاوی زۆر کوێستان لەباکوور، و دەشتایی ناوەڕاستی ناوچەکەو، بیابانی پان‌و بەرینی خواروو ، لەگەڵ بوونی سەرچاوەی گەورەی ئاوی رووباری دیجلەو زێی گەورەو ئاوی زۆری ژێرزەمینی ناوچەکە، هەموو ئەمانە، بوون بەهۆی ئەوەی، موسڵ تایبەتمەندێتی خۆی هەبێ، کە لەگشت ناوچەکە، شوێنی وا زۆر کەمە، موسڵ زیاد لەهەموو ناوەکانی، ناوێکی تریشی هەیە، کە تایبەتە بەکەش‌و هەواکەی خۆی ئەویش ناوچەی دوو بەهاری پێ ئەوترێ (ام الربیعین) یەکێکیان لەکۆتایی پایزی ساڵەوە، ئەوەی تریشیان لەیەکەم رۆژی بەهارەوە دەست پێ دەکات.

## گرنگی موسڵ

### *1- لەرووی ئابووری‌یەوە:-*

پێشتر باسی دەوڵەمەندی ناوچەکەمان کرد، لەرووی ئاوو هەواو و زۆربەی بەفرو باران لەباکوورو رۆژهەڵاتو رۆژئاوای ناوچەکە لەگەڵ بوونی چەندین رووباری وەك دیجلەو زێی گەورەو ئاوی ژێرزەمین. هەموو ئەم فاکتەرانەو زەوی بەپیتی ناوچەکە بۆتە هۆی دەوڵەمەندی ناوچەکە لەرووی کشتوکاڵی، لەدەغڵ‌و دان‌و میوەی جۆراوجۆری هاوینەو بەرهەمی کشتوکاڵی زستانەی، بەروبومی کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە، لەگەنم‌و جۆو میوەی جۆراوجۆر زۆر زیاتر بووە لەپێویستی خەڵکی ناوچەکە، بۆیە هەمیشە بەشێکی نێردراوە بۆ دەرەوەی ناوچەکە. بوونی لەوەڕگای زۆرو فراوانی لە شاخ‌و دەشتاییەکان، بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتو کاری ئاژەڵداری رەخساندوە کە ئەویش فاکتەرێکی تری بەهێزی باری ئابووری ناوچەکەیە، داهاتی زۆر کشتوکاڵی‌و ئاژەڵداری ناوچەکە. بەردەوام جوڵانەوەیەکی بازرگانی بەهێزی دروست کردوە لەئاستی ناوچەی موسڵ‌و دەرەوەی ناوچەکە. شاری موسڵیش هەمیشە وەك سەنتەرێکی بازرگانی بووە بۆ خواروی ناوچەکە کە عیراق بووەو ئێران‌و ئازربایجان لەرۆژهەڵاتو حەلەب‌و ئەستەمبول لەباکوورو باکووری رۆژئاوا، کە ئەمیش لایەنێکی گرنگی ئابووری دەسەڵاتدار بووە، گرنگی موسڵیش لەوەدا بووە، کە چەندین ناوچەو وڵاتی بەیەکەوە بەستۆتەوە دەرگای عیراق‌و کلیلی خوراسان‌و ئازربایجان‌و دەرگای رۆژهەڵاتی پێ ووتراوە[7].

گرنگی ناوچەکە لەرووی پیشەسازی‌یەوە، پاش جەنگی یەکەمی جیهانی دۆزرایەوە کە ئەمیش بۆ خۆی ئەوەندەی تر موسڵ‌و ناوچەکەی گرنگتر کرد لەرووی ئابووری‌و سیاسی‌یەوە.

## ئاڵوگۆڕی دیموغرافی‌و سیاسی ناوچەکە:...

1- <u>ئاڵوگۆڕی دیموغرافی بەهۆی فاکتەری سروشتی</u>

ساڵی 1757 کوردستان‌و ناوچەکە زستانەکەی زۆر تەڕوتووش‌و ساردبوو بارا‌ن‌و، بەفرێکی زۆری لێ باری‌و رووباری دیجلە بەتەواوی بەستی، بەڕادەیەك (20) رۆژ کاروان بەسەر رووبارەکەدا هاتوچۆی کرد، ئەو ناوچەیە کەم زستانی وا بەفرو سەرمای بەخۆیەوە بینیبوو بەهۆی ئەم سەرماو سۆڵەوە، ژمارەیەکی زۆر لەئاژەڵی کێویی ناوچەکە، کە سەروەتێکی نیشتمانی بووە تیا چوون، بەهۆی ئەو کارەساتە سروشتی‌یەوە، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی گوندەکانی ناوچەکە هاتنە ناوشاری موسڵ، بۆ ژیان و بژێوی، لەبەرئەوە پێویستی ژیان لەخۆراك زۆرگران دەست ئەکەوت، ئەو گرانیە گشت ناوچەکەی گرتەوە، خەڵکەکە لەبەر پێویستی ژیان‌و گوزەرانیان بۆ خۆراك، بەشێکی زۆریان لەکەرەستەی ناوماڵی خۆیان فرۆشت، بارەکە ئەوەندە سەخت‌و زەحمەت‌و خراپ بوو، کار گەیشتە ئەوەی هەندێ خەڵك سەودا بە منداڵ‌و

جگەرگۆشەی خۆیان بکەن، ئەو کارەساتە سروشتییە، گووندو شارۆچکەکانی باکورو رۆژهەڵاتی موسڵی گرتەوە، کە ڕێژەی دانیشتوانیان بەگشتی کورد بوون.

لەگەڵ نزیك بوونەوە لەکۆتایی زستان، پاشای موسڵ فەرمانی دەرکردنی ئەو خەڵکە هەژارو غەریبەی راگەیاند. ئەوانیش بەناچاری شارو ناوچەکەیان جێهێشتو روویان کردە بەغدا، ئێران، ئازربایجانو قەڵاچوالان ( کە ئەو کاتە میری بابانیەکانی تێدا بوو). بەهۆی کارەساتی سەرماو بەفرەوە، ژمارەیەکی زۆر لەهاوڵاتیانی کورد گیانیان لەدەست دا، تەنانەت کەس نەبوو تەرمەکانیان بشارێتەوە!

سروشتی ئەو ساڵە هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو لەکۆتایی بەهارو سەرەتایی هاوینی هەمان ساڵدا، ناوچەکە، کەوتە بەر هێرشی کوللە، ژمارەیان ئەوەندە زۆر بووە، کە لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا تەرووشکی دەغڵودانو لەوەڕی بەیەکەوە خواردووە، ئەمیش بەشێکی خەڵکی ناوچەکەی ناچار کرد، کەسەر هەڵبگرنو رێگای ئاوارەیی بگرنە بەر، بەرەوە بەغداو ئێرانو ناوچەکانی دەوروبەر. ئەو دوو کارەساتە، کارەساتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیشی بەدواوە بوو، بۆیە رێژەی مردن ئەوەندە زۆر بووە، کە فریای ناشتنی تەرمەکان نەکەوتن[8].

بەهۆی ئەو هەموو کارەساتە یەك لەدوایەکانەدا، لەبەفرو سەرماو سۆڵو هێرشی کوللەو بڵاووبونەوەی نەخۆشیو گرانی ناوچەکە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هاوڵاتیانی ناوچەکەی، بەتایبەتی کورد ژیانیان لەدەستدا، و بەشێکی زۆری تریشی بەناچاری ناوچەکەیان جێهێشت.

میللەتی کورد، گەر شتێکیش بەرگری کردبێ لەخۆیو وڵاتەکەی لەفەوتان بەرامبەر بەداگیرکەران بەشێوازی جیاجیا...، بەڵام لەئاستی کارەساتە سروشتییەکان، توانایەکی ئەوتۆی نەبووە، چونکە، کارەساتو بەسەرهاتەکانی ئەوەندە زۆر بوون، ، رێگەی نەداوە میللەتی کورد سود لەداهاتی ئابوری خۆی وەربگرێ، هەم بۆ پاراستنی ژیانی خۆی لەکارەساتو ئافاتو هەم بۆ گەشە پێدانی ژیانی خۆی لەرووی ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو کلتورییەوە.

کۆچ پێکردنی کورد لە زێدو وڵاتی خۆی، بەهەر هۆیەك بێت، هۆی سروشتی، سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، ئافاتو نەخۆشی،... ئەنجامەکەی لەدەستدانی خاكو زەویو ئاوو سەروەتو سامانی بووە، کە بۆ میللەتێکی داگیر کراوو ژێردەستە کارەساتێکی هەمیشەیی دروست دەکاتو، هەتا ماوە لە کۆڵی نابێتەوەو لە ژیانی خۆیو نەوەکانی رەنگ ئەداتەوە.

بێگومان نەتەوەی سەردەست تورك بێ یاخود عەرەب، ژیانی باشترو مسۆگەرتر دەبێت، هەروەها سودمەند دەبێت لەم حاڵەتە، چونکە ئەو نەتەوانە لەو سەردەمەدا، دەسەڵاتیان لە پشت بووە، هاوکاریو کۆمەك کراون، لەکاتی تەنگانەو کارەساتو لێقەوماندا، جێگیرکراون لەناوچەکە بەهاوکاریو یارمەتی زۆرەوە. گومان لەوەشدا نییە، ئەو کوردانەی لەو سەردەمانەدا ئاوارەو پەناهەندەی ئەم وڵاتو ئەو وڵاتو ناوچە بوون تێکەڵی نەتەوەو میللەتانی تری ناوچەکەو دونیا بوون، بەشێوەیەك لەچوارچێوەی باری ئابوریو فەرهەنگیو سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەو نەتەوانەدا تواونەتەوەو ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان لەدەست داوە، کە ئەمیش بۆ خۆی کارەساتێکی گەورەیە چونکە هەم وڵاتو نیشتمانی لەدەستچوو، هەم ناسنامەی نەتەوەیی.

### 2- ئاڵوگۆڕی دیموگرافی ناوچەکە بەهۆی باری سیاسیو شەرو ململانێ ناوچەییو نێودەوڵەتیەکانەوە

1)موسڵ لە سەردەمی پێش زاینی، ناوچەیەکی پڕ لەشەرو ململانێ بووە لە نێوان داگیرکەرانو پاشاکانی ناوچەکەو هەندێ جاریش لە نێوان داگیرکەرانی رۆژئاوا(رۆم، یۆنان)و رۆژهەڵات( ئێران ، مەغۆل...).

هێرشی دەوڵەتی فارس لە ساڵی 552 پ . ز بۆ سەر ناوچەکە، پاشان تێکشکاندنی دەوڵەتی فارس لە ساڵی 336 پ.ز لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنیو هاتنەوەی ساسانیەکان لەساڵی (24-272)ز . سەرەئەنجام هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەی موسڵ لەساڵی 16ك (637ز).

کورد لەبەر ئەوەی هێزو دەسەڵاتی پێویستی نەبووە بۆیە زۆرجار بەناچاری کەوتۆتە لایەنێکی شەرو ململانێوەو زیانی زۆری گیانیو ئابوری لێ کەوتووە.

خۆ ئەگەر بەگیانیش بەشداری نەکردبێ لەو شەرو ململانێیەو نەکەوتبێتە لایەکی شەرەوە، ئەوا کەوتۆتە بن دەستو پێی داگیرکەرانو وڵاتەکەی بۆتە مەیدانی شەڕو سەروەتو سامانیشی بۆتە خۆراكو زەخیرەی شەڕو بەتاڵان چووە. ئەنجامی ئەو بارودۆخەش میللەتی کوردی زۆر پاش خستووە، نەیتوانیوە خۆی رێك بخاتو خۆی دروست بکات لەرووی سیاسیو سەربازیو ئابوری هاتنی میللەتان بۆ ناوچەکە بە رێگەی

داگیرکردنو، تێکەڵ بوونیان بە میللەتانی ناوچەکە بۆ ماوەیەکی زۆر (سەدان ساڵ)، کاریگەری زۆری دەبێت بۆ سەر گۆڕانی باری نەتەوەییو سیاسیو کۆمەلایەتیو ئابوریو فەرهەنگی ناوچەکە.

2) هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ ناوچەی موسڵ یەکەم پرۆسەی تەعریبە

لەکاتی هاتنی لەشکری ئیسلام لەساڵی 16ك (637ز) لەسەردەمی عومەری کوری خەتاب بۆ موسڵو ناوچەکە، کە لەژێر دەسەلاتی رۆم دا[9] بووە، شاری موسڵ ئەو کاتە تەنیا لە سێ گەرەك پێکهاتبوو، یەکەمیان مەسیحیەکان، دووەمیان زەردەشتیەکانو سێهەمیان گەرەکی یەهودیەکان بوو. لەهێرشی یەکەمی لەشکری ئیسلام و هۆزو خێڵە عەرەبەکان بۆ سەر شاری موسڵ بەسەرپەرشتی (عیاض بن غنم الاشعري وعمرو بن جند) کە نێردرابوون بۆ کردنەوەی ولاتی کوردان[10]، دوای شەرو کوشتاری زۆر، بەشێك لەشارەکەیان تالان کرد، بەلام خەلکی موسڵ لێیان راپەرینو تالانەکەیان لێیان وەرگرتەوەو عمر بن جندیان کوشت. دوای ئەو شکستە، خالدی کوری وەلید پەلاماری دانو تێکیانی شکاند، دوای شەرەکە خێڵی(قەبیلە) عەرەبیان بە ناوی خەزرەج لەشارەکە نیشتەجێ کرد، بۆ ئەوەی جارێکی تر لێیان هەلنەگەرێنەوەو هەم بۆئەوەی باجیان لێ وەربگرن. بەو شێوەیە یەکەم قەبیلەی عەرەب لە شاری موسڵ نیشتەجێ کران[11] و یەکەم گەرەکو یەکەم مزگەوت بەناوی خەزرەج لەناو شاری موسڵ دروست کرا[12].

دوای ئەوەی گرنگی ناوچەکەیان زانی لەرووی ئابوریو بازرگانیو سیاسیو سەربازییەوە دەرگایان خستە سەرپشت بۆ هاتنی هۆزو خێڵە عەرەبەکان وەك (تەمیم، تەغلوب، بەکر، قەیس، نمر، ربیعە (ناوچەی ربیعە لەموسڵ بەناوی ئەو خێڵەوەیە)، خزاعە، ئەزد) و دەیان تیرە و هۆزو خێڵی تر. لەسەردەمی خەلافەتی خەلیفەی ئیسلام عوسمانی کوری عەفان، کۆچی عەرەبەکان زۆر زیادی کرد بۆ ناوچەکە، بەتایبەتی دوای بەهێزبوونیان بەفەرمانی خەلیفە چوار هەزار کەس لە قەبیلەکانی (ئەزد، تەی، کندە، عبدو قیس...) هەروەها لەسەردەمی خەلافەتی ئیمام عەلی کوری ئەبی تالب، ژمارەیەکی زۆر لەهۆزو تیرە عەرەبەکانی کوفەو بەسرە کۆچیان بۆ شاری موسڵو ناوچەی موسڵ کرد. بەو شێوەیە موسڵ فراوان بووەو، عەرەبەکان کردیان بە شوێنی نیشتەجێکردنی خۆیان.

لەبەر گرنگی موسڵ بۆ کاروباری بازرگای و بۆ شەر[13]، ئەمەویەکانیش گرنگی تایبەتیان بە موسڵدا.

لەساڵی (1200ك) ژمارەیەك لە خێڵە عەرەبەکانی شەمەرو تەی (طـی) کە دەوارنشین بوون لەعەرەبستانی سعودی، لەناوچەکە نیشتەجێ کرانو عەشیرەتەکانی عوبێد و جبورو عگیداتو حدیدو لهیب ئەمانەش هەمووی عەرەبی دەوارنشین بوون لە ناوچەکانی موسڵو خوارووی هەولێرو خوارووی کەرکوك نیشتەجێ کران[14].

3) بەهۆی باری قورسی ژیان لەلایەك و، زۆری باجی دەوڵەت لەسەر هاوولاتیان، بەتایبەتی لەسەر کورد، بۆیە زۆر جار کوردەکان باجی دەوڵەتیان رەت دەکردەوەو باجیان بەدەوڵەت نەئەدا، لەبەرئەوە دەوڵەت تاوانباری کوردەکانی دەکرد، بەوەی شەرو ئاژاوە لەناوچەکە دروست دەکەن ئەمیش بیانوو بوو بۆ ئەوەی پەلاماریان بداتو تالانیان بکاتو لەناوچەکە دەریان پەرێنێ. ئەم حاڵەتە لەسەردەمی ئەمەویەکان زۆر جار روویداوە.

لەسەردەمی موعتەسەم (دوای مردنی مەئمون لەساڵی 833ز (218ك) یەکێك لە کوردەکان بەناوی جەعفەر کوری فەهرجس، بەهۆی زوڵمو ستەمی خەلیفە لەدەوڵەت یاخی بوو، لەبەر ئەوە، ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان پشتگیریان کردو لەگەڵیدا بوون[15]، بەلام دەسەلاتداران لەویلایەتی موسڵ، بەناوی ئەوەی جەعفەر باج لەهاولاتیان وەردەگرێ[16]! (کە ئەمەیان راست نییە چونکە وا بوایە کوردەکان پشتگیریان نەدەکرد) هەر لەبەر ئەوە هێزێکی زۆریان لەدژی جولانەوەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە کۆکردەوە بۆ شەری کوردەکان... ئەنجام هێزی دەوڵەت زۆر خراپ شکا... خەلیفە لەناوچەکانی ترەوە هێزی بۆ ناردن لەساڵی 839ز (225ك) ... ئەمجارەش پەلاماری هێزی کوردەکانیان دا لە چیای داسن (مقلوب)، پاش شەرێکی قورس جەعفەر کوژراو جولانەوەکە تەواو بوو. دوای کپکردنەوەی بزوتنەوەکە دەوڵەت کەوتە گیانی کوردی ناوچەکەو ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتو ژمارەیەکی لێ گرتنو خەلیفە تالان کردنی ماڵەکانیانی حەلاڵ کرد[17] دوا جار دیلو ژنو منالەکانیان راگواستن بۆ تکریت، بەو شێوەیە ژمارەیەکی زۆری لەعەرەبەکان لەسەر ئەرزو ئاوی ئەو کوردانە نیشتەجێ کران.

4) لەسەردەمی (المكتفی باللە) لەساڵی 906 ز (294ك)، کە حەمدانییەکان حوکمڕانی ویلایەتی موسڵیان دەکرد جوڵانەوەیەکی تری کوردەکان ، بەسەرۆکایەتی محمد کوڕی بلال[18] دروست بوو، دوای ئەوەی والی موسڵ نەیتوانی جوڵانەوەکە تێك بشکێنێ، بۆیە پەنای بردە بەر خەلیفە، بۆ ئەم جوڵانەوەیەش، هێزێکی زۆریان کۆکردەوەو جوڵانەوەکەیان لەناوچەکە دەرپەڕاند بەرەو سنوری ئازربایجان ... ئەنجامی ئەم جوڵانەوەیە، ئەوە بوو ژمارەیەکی زۆر ئاوارەی وڵاتان بوون‌و، خەڵکی زۆر کوژراو، سەروەت‌و سامانیشیان هەمموو بە تاڵان چوو.

5) سەردەمی حوکمڕانی حەمدانیەکان لە موسڵ‌و ناوچەکانی، سەردەم‌و ڕۆژانێکی ڕەش بووە لەمێژووی کورد، حەمدانییەکان زۆر ستەمکار بوون بە هەقی میللەتی کورد. یەکێك لە کێشە بنچینەیەکانی ئەو سەردەمە، لەگەڵ دەسەڵاتداران، کۆکردنەوەی زەکات‌و باج‌و خەراج بووە لە خەڵك، هەر لەبەر ئەوەی هەندێ جار خەڵك ملی نەداوە باجیان بداتێ، بۆیە دەسەڵاتدارانی حەمدانی زۆر بەتوندی بەگژی کوردەکاندا چوون‌و بەهەمموو توانایان لێیانداون. جارێکیان لەڕووداوێکی لەو جۆرەدا، دەسەڵاتداران یاخیبووەکانیان بەخشی(لێبوردن). بەڵام هەر کە خۆیان دا بەدەست فەرماندەکەوە، هەموویانی دەستگیرکردو لەنێوان زاخۆو موسڵدا لەخاچ دران[19].

لەسەردەمی (صمصام الدولة) کوڕی (عضد الدولة)، کەوتنە دژایەتی کردنی کوردەکان‌و شەڕێکی گەورەیان لەدژی سەرۆکی کوردە حەمیدییەکان ئەبو عەبدوڵڵا ئەلحوسین کوڕی دۆشتك ناسراو بە (باذ)ی کورد بەرپاکرد، لەبەر ئەوەی پیاوێکی ناسراوو بەناوبانگ‌و ئازاو سەخی و خۆشەویست بوو لەناو خەڵك، هاوکاری‌و یارمەتی خەڵکی دەدا، بۆیە کاتێ (عضد الدولة) مسئولیەتی موسڵی گرتە ئەستۆ، (باذ)ی کوردی بینی، زۆر سڵی لێکردەوە، لە بەرئەوە فەرمانی دەرکردو پلانێکیان بۆ لە ناودانی کێشا ، بەڵام کاتێ کە (باذ) بەپلانەکەی زانی هەڵات‌و ناوچەکەی چۆڵ کرد[20]. پاشان ژمارەیەکی زۆری خەڵکی لێکۆبووەوە، تەنانەت خەڵکی عەرەبی زۆریان لەگەڵدا بوو، ئەویش هەر کە پشتگیری‌و دەسەڵاتی پەیدا کرد، کەوتە پاککردنەوەی شارو ناوچەکان لەدەسەڵاتی حەمدانیەکان. لەو ماوەیەدا چەندین هێرشی گەورەیان کردە سەر هێزەکانی (باذ)ی کورد، بەڵام ئەنجامەکەی بە تێکشکاندنی خۆیان تەواو بوو، تا دەهات هێزی زۆر دەبوو و ناوچەکانیش فراوانتر دەبوو، ئەنجام لە ساڵی 983ز (373ك) دەستی بەسەرشاری موسڵیش دا گرت‌و بۆ ماوەی یەك ساڵ حوکمڕانی موسڵی کرد. دوا جار هێزێکی گەورەیان لەدژی کۆکردەوەو لەشاری موسڵ دەریان پەڕاند، بەڵام جوڵانەوەکە بەکزی هەر مایەوە بۆ دوا جار لەشەڕێکا بەبرینداری (باذ) دەستگیر دەکرێ‌و دەکوژرێ. بەنی حەمدان ئەوەندە داخ لەدڵ بوون بەرامبەری‌و بەرامبەر بەکورد، بۆیە تەرمەکیان هێناو بۆ چاوترساندنی خەڵکی موسڵ لەناو شاری موسڵ لەخاچیاندا، بەڵام خەڵکی شاری موسڵ زۆر بەتوندی ناڕەزاییان لە بەرامبەر ئەو کارە دەبڕی‌و بە دەسەڵاتدارانیان وت نابێ پیاوی ئازا بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، هەر لەبەر ئەوە تەرمەکەیان داگرت‌و نوێژیان لەسەر کردو بەرێگای ئوسوڵی ناشتیان. گومانی تێدا نییە لەئاکامی ئەو هەمموو شەڕو شۆڕەو دەست بەسەرداگرتنەی شاری موسڵ، خەڵکێکی زۆری توش هاتووەو، بەئاگری ئەو شەڕوشۆڕەوە سوتاوە، بەتایبەتی کوردەکانی ناو شاری موسڵ. هەر لەبەر ئەوە ئەوانیش کەوتنە بەر شاڵاوی دەرکردن‌و ڕاوەدونان لەشارو ناوچەکان‌و بەهۆیەوە شارو گوندو ناوچەکانی خۆیان لەدەستداو سەروەت‌و سامانیان بەتاڵان چوو، جگە لە کەوتنە ژێر دەستی نەتەوەی دەسەڵاتدار خۆشیان دەربەدەری ناوچەکانی تر بوون.

6)موسڵ‌و ناوچەکانی سەردەمی جۆراوجۆریان بەخۆوە بینیوە لەئاشوری‌و کلدانی‌و فارس‌و ئیسلامی‌و عەرەبی‌و عوسمانی، هەر دەسەڵاتێك لەناوچەکە بووبێ، بەتایبەتی دوای هاتنی ئیسلام، عەرەب بەناوی ئیسلام یان تورك بەناوی ئیسلام هەوڵیان داوە، میللەتانی ناوچەکە بەگژیەکدا بکەن... هەندێ جار کوردیان بەگژ ئاسوریەکاندا کردووەو ئاسورییەکانیان بەگژ کوردەکاندا کردووە، زۆر جاریش عەرەبیان بەگژ هەردووکیاندا کردووەو تەنانەت زۆر جاریش کوردیان بەگژ کورددا کردووە، شەڕو دوژمنایەتی گەورەی لێ کەوتۆتەوە. هەمموو ئەو شەڕو ئاژاوانە بۆ ئەوە بووە دەسەڵاتداران باڵادەست بن‌و فیتنەو ئاژاوەو دوژمنایەتی دروست بێت لەنێوانیاندا بۆ ئەوەی قەت یەك نەگرن،... ئەم بەسەرهات‌و کارەساتانەش کە باسی دەکەین، مشتێکن لەخەروارێك:

1- باری ژیانی کورد بەگشتی و کوردە یەزیدییەکان بەتایبەتی لەکۆتایی سەدەی حەوت بەرەو ناڕەحەتی‌و نائارامی چووە. لەسەردەمی سەلجوقیەکان‌و لەساڵی 1057ز (449ك) زۆر خراپ بوو. کاتێ (طغرل) تەغرول بەگ پەلاماری ناوچەی موسڵ‌و سنجاریدا بەتایبەتی هەرچی گوندی یەزیدییەکان بوو کەوتە بەر شاڵاوی تاڵان‌و سوتاندن‌و وێرانکردن، خەڵکەکەشیان دەربەدەرو ئاوارە کرد. لەناو شاری موسڵ (4000) کەسی کوشت‌و خەڵکێکی زۆری لەکوردو کوردی یەزیدی‌و بەتایبەتی لەناوچەکە ڕاگواست.

2- حکومەتی عوسمانیش لەوانەی پێشووی خۆی چاکتر نەبووە لەگەڵ کوردو کوردی یەزیدی بەتایبەتی بگرە زۆریش خراپتر بووە، بەردەوام بەسووکی‌و بەگومان‌و نیاز خراپی سەیری کوردی کردووە. بۆیە هەمموو ڕێگاکانی گرتۆتەبەر بۆ لەناودان‌و سەرکوتکردنیان، جا چ

بەرێگای شەڕو کوشتن‌و تالآن کردن بوو‌بێت‌و یان بەرێگای ڕاگواستن‌و دەرکردنیان لەناوچەکە یاخود بەرێگای دروست کردنی فشاری زۆری جۆراوجۆر بوو بێت بۆ ئەوەی دەستبەرداری ئایینی یەزیدی بن، لەبەرئەوە کوردە یەزیدییەکانیش هەمیشە لەجولانەوەو شۆڕشدا بوون لەپێناوی مانەوەو بەدەست هێنانی مافەکانیان لەدژی داگیرکەران‌و ستەمکاران. لەساڵی 1166ک، حکومەتی عوسمانی بەسەرپەرشتی وەزیر سلێمان پاشا، هەڵمەتێکی گەورەو فراوانی کردە سەر کوردە یەزیدیەکان لەناوچەی شەنگار و کوشتارێکی زۆری لێکردن‌و زۆری لەژن‌و منداڵ‌و پیرو پەککەوتە لێگرتن، هەموو سەروەت‌و سامانیشیان بەتالآن چوو، دەغڵ‌و دانیانی سوتاندن‌و باخ‌و بیستانیان لەرەگەوە دەرهێنرا. لەگیراوەکانیش لەملی ژمارەیەکی زۆریاندا لەپیاوەکان سەریان بڕین‌و، نزیکی سێ سەد کەللە سەریان بۆ ئوستانە نارد[21]، سەربڕین‌و ناردنی کەللە سەرەکان بۆ ئوستانە هەم بۆ چاوترساندنی میللەت بوو هەم بۆ ئەوە بوو بابولعالی (باب العالی) زیاتر بڕواو متمانەی بەوەزیرو پاشاکانی ناوچەکان بێت.

3) هەر کاتێ لایەك لەکوردو ئاسوریەو عەرەب نفوزی لەزیادبووندا بوبێ لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی بیانویەکی بەلایەك گرتووە بۆ لێدان‌و لاوازکردنی لایەکی تر ئیتر ئەوە دەبوو بە بیانوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی هێز کۆبکاتەوە بۆ قەتڵ‌و عام کردنی خەڵکەکەو تالآن کردنیان.

لەساڵی 1808 ز (1223ك) کوردەکانی ناوچەکەی کرد بە گژ ئاسوریەکان‌و بەهۆی ئەو شەڕەوە کوردو ئاسوری زیانی زۆریان لێکەوت لەسەر ماڵ. ئەو شەڕەش بوو بەبیانوو تا عوسمانیەکان هێرش بکەنە سەر کوردەکان‌و بەو جۆرە ژمارەیەکی زۆری لێگرتن‌و کوشتن، ئەوانەی دەستگیرکران، نەفی کران[22].

دیارە بەهۆی ئەو شەرەوە، بەشێك لە ئاسوریەکانیش، بەناچاری ناوچەکانیان چۆڵ کرد بەمەبەستی دەربازبوون لە شەڕو خۆ بەدوور گرتن لەشەڕو فتنەو دوژمنایەتی. بەو شێوەیە ناوچەکە لە کورد چۆڵ دەکرا ، ئەوکاتەش زەمینە خۆش دەبوو بۆ هێنانی خەڵکی تر لە تورك‌و عەرەب بۆ ناوچەکە.

4) عوسمانیەکان تەنیا بەوە نەوەستان کە خەڵکی ناوچەکە بەگژ یەکدا بکەن بەڵکو کەوتنە ئەوەی شەڕی گەورە لەنێوان ئیمارەتە کوردییەکان بنێنەوە، لەبەر هۆیەکی سادە، پاشای رەواندوز( محمەد - پاشای کوێرە)، لەساڵی 1832ز (1248ك) بە بەرچاوی عوسمانیەکانەوە هێرشی هێنایە سەر کوردە یەزیدیەکان‌و ناوچەکە، تا شەڕ گەیشتە چیایی جودی‌و شەنگارو دەوروبەری شاری موسڵ. پاشای رەواندوز، لەساڵی 1833ز (1249ك)[23] پەلاماری ناوچەی بادینان‌و موسڵی دایەوە بەڵام ئەمجارەیان تیرەو تایفەو عەشیرەت‌و ئیمارتی ئامێدیشی گرتەوە، ماوەی سێ مانگ بە هێزێکی زۆرەوە ناوچەکەی گەمارۆدا ، ئازووقەو خۆراکی ناوچەکەی لە بن هێنا، ئەنجام بەوە کۆتایی هات کە ئامێدیش بکەوێتە سنوری دەسەڵاتی پاشای کوێرەو برایەکی خۆی بەناوی (رەسوڵ) لە جێگای سەعید پاشا دانا. بەم شێوەیە تۆوی ناکۆکی‌و دوژمنایەتی، ناوچەیەکی فراوانی لەکوردستان گرتەوە، بەهۆیەوە بە هەزاران ماڵی کورد لە یەزیدیی‌و عەشیرەتەکانی ناوچەکە سنورەکەیان چۆڵ کرد، دوای زیانێکی زۆر لەسەروماڵی کورد، ئەم شەڕو دوژمنایەتیەش ئەنجام بە قازانجی زۆری دەوڵەتی عوسمانی گەڕایەوە.

5) دەوڵەتی عوسمانی لەسنوری موسڵ‌و ناوچەکانی سێ مەسەلەی زۆر گرنگ بوو:-

1- چاککردنی ژیانی هێزی سەربازی لەشکرەکەیان چونکە بەو لەشکرە هەموو شتێکیان دەکرد لەشاری موسڵ‌و ناوچەکە، کە ئەوەش بە کۆکردنەوەی زەکات‌و باج دەبێ.

2- دروستکردنی فشار بۆ ناچارکردنی عەشیرەتە کۆچەرەکانی عەرەب بە تایبەتی شەممەر بۆ نیشتەجێ کردنیان، بۆ ئەوەی هەم هاوسەنگی ناوچەکەی پێ راست بکەنەوە بەرامبەر بە کوردو نەتەوەکانی تر، چونکە رەگەزی ئاری‌و زەردەشت‌و یەزیدی‌و شیعە پەسەند نەبوون لەلای دەوڵەتی عوسمانی‌و هەم باج‌و خەراجی بەردەوامیان لێوەربگرن، چونکە لە حاڵەتی کۆچەری کەمتر دەستگیر دەکران‌و کەمتر ملیان ئەدا بە باج‌و خەراج.

3- ئامۆژگاریکردن‌و ئاگاداریکردن‌و ترساندنی کوردە یەزیدیەکان بۆ مەبەستی دەست بەرداربوونیان لە ئاینی یەزیدی‌و بڕوا هێنانیان بە ئاینی ئیسلام.

بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی ئابوریان، هەموو جۆرە فشارێکیان دەخستە سەر هەژارنی ناوچەکە. لەبەر ئەوە بەشی هەرە زۆری هەژاری ناوچەکە ناچار بوون جل‌وبەرگ‌و کەرەستەی ماڵی خۆیان بفرۆشن، بۆ رزگار بوون لەشەڕو دەسەڵاتی عوسمانی.

هەرکەسێ دوا بکەوتایە لە دانی باج، روویان رەش دەکردو دەستو پێیان بەزنجیر کۆت دەکردو، بە ناو شەقامو بازاردا دەیانگێرا بۆ ترساندنو تۆقاندنی هاولاتیان[24]. بۆ مەبەستی ئیسلام بوونی یەزیدیەکانیش بەردەوام لە هێرشو پەلاماردانی ناوچەکانیان بوو بەتایبەتی ناوچەکانی سنجارو شێخان.

دوای هێرشو پەلاماری پاشای رەواندز بۆ سەر یەزیدییەکان... هەڵمەتی محەمەد شەریف پاشا لەساڵی(1844ز) 1260دەستی پێکرد، هەر لە هەمان ساڵدا، حافز پاشا هەڵمەتێکی تری کردە سەرکوردە یەزیدییەکان لە ناوچەی سنجارو لەم دوو هەڵمەتەدا شەڕی خوێناوی روویدا. مستر (لایارد) کە گەڕۆکێکی ناسراوی ئەو سەردەمەی بوو دەڵێ: 3⁄4 دانیشتوانی چیا ( مەبەست لە چیای سنجارو شاخەکانی تر بووە، کە کوردە یەزیدییەکان خۆیان تیا حەشاردابوو) بە گوللە و تەقەمەنی سەربازەکان کوژران، و هەر کەسێك پەنای بردبێ بۆ ئەشکەوتەکان، سەربازەکان دەوریان داون، و ئاگریان لە ئەشکەوتەکان بەرداوەو مردوون، یان سووتاون، یاخود خنکاون. منداڵەکانیشیان گواستەوە شارەکان بۆ فرۆشتنیان. لایارد ئەڵێ: پاشماوەی کوردە یەزیدییەکان ناچاربوون شارو گوندەکانی خۆیان چۆڵ بکەن و پەنابەرن بۆ شەڕی پارتیزانی لە دژی دەسەلاتدارانی عوسمانی، بۆ بەرگری لەژیانی خۆیان. لەساڵی 1845ز (1261ك) کریدلی محمد پاشا زۆری بەکوردە یەزیدییەکان کرد، لە کوشتنو بڕینو گرتنو شێخی یەزیدییەکانی دەستگیرکرد بەناوی شێخ ناصر.

هەر لەساڵی 1846ز (1262ك) والی (طیار) تەیار پاشا بەهێزێکی زۆرەوە هێرشی کردە سەر سنجار، خەڵکەکە بەرگرییان لەخۆیان کردو شەڕیان لەگەڵ لەشکری عوسمانی کرد، بۆیە هێزێکی زۆریان لەدژیان کۆکردەوەو، پەلاماری ناوچەکەیاندا هەرچییان دەسگیربوو کوشتیان لەژنو منداڵو پیر.

زوڵمو ستەمی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان، عەبدولحەمیدخان کوڕی عبدالمجید، لەئاستی کوردە یەزیدییەکان لەهەڵکشاندا بوو، یەکێك لە کاربەدەستە دڵڕەقەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ لەناوبردنو کۆتایی هێنان بە یەزیدییەکان وەك ئاین، بەناوی فەریق عومەر وەهبی پاشا. لەدرێژەی کارەکانی، هەموو گەورە شێخانی یەزیدییەکانو خەڵکی زۆری کوردە یەزیدیەکانی دەعوەت کرد، ژمارەیەکی زۆر لەگوندەکانی شێخان ئامادەی بوون لەتەك چوار گەورە شێخیان. خەڵکەکە نەیاندەزانی بۆچی دەعوەت کراون. لەکاتی گەیشتنیان زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێکرا لەلایەن گەورە پیاوانی ئاینیو سەربازی ناوچەکە، و بەرێو رەسمی سەربازی. تاگەیشتنی بە بارەگای والی لەوێ لەگەڵ ئەمیرەکەیان بەناو میرزا بەگ، لەسێ ریز رایانگرتن، والیو فەریقیش لەشوێنی تایبەتی خۆیان، بەکوردە یەزیدییەکانیان راگەیاند، کە فەریق فرمانی دا، شەیتان بەلەعنەت بکەن! هەموویان بێ دەنگ بوون، فەرمانەکەی سێ جار وتەوە یەزیدییەکان بێ دەنگ بوون ، فەریق فەرمانیدا کە لێیان بدەن. لێیان دان، تا سیانیان گیانیان لەدەستدا، بروسکەیان بۆ ئوستانە کرد، پێیان راگەیاندن، کە (20) بیست هەزار یەزیدی بوون بە موسوڵمان، داوای دیاریان کرد بۆ میرزا بەگو براکانی، لە بری ئەوەی هاوکاری عومەر پاشایان کرد، ئوستانەش دیاری بۆ ناردن، بەلام کە بینیان توندو تیژی رێگە چارەنییە. ئەمجارە مامۆستایان بۆ ناردن، بۆ ئەوەی فێری سەرەتاکانی ئاینی ئیسلامیان بکەن، بەلام خەڵکی یەزیدی لە گوندەکان قەبوڵیان نەکردو مامۆستاکانیان دەرکرد. کە عومەر پاشا ئەمەی زانی بەهێزێکی زۆر پەلاماری دان، ئاگریان لە ژمارەیەك گوند بەردا، چی سەروەتو ماڵیشیان هەبوو بە تالان چوو خەڵکی زۆریان لێکوژرا[25].

ئەو زوڵمو تاوانەی دەوڵەتی عوسمانی و فەریق وەهبی، ولاتانی بیانی پێیان زانیو ئاگاداری باڵیوزەکانی خۆیان لە ئوستانە کردەوەو. دوای ئەوە (باب العالی) لیژنەیەکی نارد بۆ لێکۆڵینەوە، لە ساڵی 1891ز (1309ك) فەریق عومەر پاشایان لەکارخستو بانگ کرا بۆ ئوستانە. بەلام دوای چی ؟ خۆ ئوستانە بە کارەساتو کوشتنو لەناودانی یەزیدییەکانی دەزانی! خۆ (باب العالی) خۆی دیاری بۆ میرزا بەگ نارد لەبری بەموسڵمان بوونی خۆی و (20) هەزار کەس لە یەزیدییەکان. بانگ کردنەوەی فەریق عومەر پاشا بۆ ئوستانە ، تەنیا بۆ ئەوەبوو کە ناڕەزاییەکە کۆتایی پێبهێنن.

ئەنجام ئەوەی بەسەر میللەتی کورد بەگشتی و کوردە یەزیدییەکان بە تایبەتی هات، لەکوشتنو بڕینو تالانکردنو راگواستنو دەربەدەرکردنیانو داگیرکردنی خاكو سەروەتو سامانیان، لەسەر دەستی داگیرکەران بەگشتیو عوسمانی بەتایبەتی ، مەگەر هەر بە ئەرمەنییەکان کرابێ لەو سەردەمەدا.

کوردە یەزیدییەکان لە ناوچەکانی حەلەبو وانو ئەرزروم هەن، بەلام زۆربەیان لە ناوچەکانی دەوروبەری موسڵ، لەشێخان و شەنگار بەتایبەتی نیشتەجێ بوون، بەهۆی بوونی مەڵبەندی ئایینی یەزیدییەکان لەو ناوچەیە، ژمارەی کوردە یەزیدییەکان لە سەدەی نۆزدەمی

زاینی بە(300000) سێ سەد هەزار کەس لەو ناوچەیە مەزەندە کراوە. کەچی تورکەکان لەساڵی 1021 بە (18000) هەژدە هەزار کەس مەزەندەیان کردوون و بەریتانیا بە (30000) هەزار و حکومەتی عیراقیش لە ساڵی 1922-1924 بە 26000 بیستو شەش هەزار کەس مەزەندەیانی کردووە(26). خوێنەر لە بەراوردکردنی ئەم ژمارانە، راستییەکانی بۆ روون دەبێتەوە کە دەوڵەتی عوسمانیو ئەوانەی پێش عوسمانی چ کارەساتێکیان بەسەر میللەتی کورد بەگشتیو کوردی یەزیدی هێناوە.

**پەراویز**

1. سعید الدیوەجی، الموصل في عهد الاتابکی، ص6
2. هەمان سەرچاوە، ص6
3. القس سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، الجزء الاول، ص56
4. سعید الدیوەجی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
5. محمد امین زکي، خلاصة تاریخ الکرد والکردستان من اقدم العصور ، الجزء الاول.
6. القس سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، ، الجزء الاول، 1923م
7. هەمان سەرچاوە.
8. حسب مذکرات دومینیکۆ لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر، ترجمة الفس روفائیل بید لوید
9. القس سلیمان الصائغ ، تاریخ الموصل، الجزء الثانی،
10. القس سلیمان الصائغ ، تاریخ الموصل ، جزء الاول ، 1923
11. القس سلیمان الصائغ، تاریخ الوصل، ص59 ، جزء الاول، 1923
12. هەمان سەرچاوە، ص51 .
13. سعید الدیوەجی، الموصل في العهد الاتابکی، ص8
14. القس سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، جزء الاول. 1923
15. هەمان سەرچاوە، ص78.
16. هەمان سەرچاوە،
17. هەمان سەرچاوە، ص79.
18. هەمان سەرچاوە، ص79.
19. هەمان سەرچاوە، ص125.
20. هەمان سەرچاوە، ص127.
21. رسول الکرکوکلي، دوحة الوزراء في تاریخ بغداد الزوراء، نقله عن الترکیة، موسی کاظم نورس، ص 81-82
22. هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص302
23. تاریخ الموصل ، هەمان سەرچاوە
24. تاریخ الموصل، هەمان سەرچاوە
25. القس سلیمان الصائغ ، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

26. د. حسين فاضل، مشكلة الموصل، ص 82

## سەرچاوەكانی تر كە سودی لێوەرگیراوە

1- د, علاء نورس، حكم المماليك في العراق.
2- محمد امين العمري، منهل الاولياء.
3- منذر الوصلى، عرب واكراد.
4- د. فرج بصمچی، كنوز المتحف العراقي.
5- طة الهاشمي، جغرافية العراق.
6- د. علاء نورس، العراق في العهد العثمانی.